پ. د. عەلائەددین باشار



# گفتوگۆیەک سەبارەت بە







ناوی کتێب:  گفتوگۆیەك سەبارەت بە حەقیقەت

نووسەر: پرۆفیسۆر دکتۆر عەلائەددین باشار

وەرگێڕ: حەسەن حەمەکەریم

تیراژ: (١٥٠٠)دانە

نۆبەی چاپ: یەکەم

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە ( ٢٢١٥ )ی ساڵی ٢٠١١ ی پێ دراوە






ناوەندی راگەیاندنی ئارا



ناونیشان: ناوەندی راگەیاندنی ئارا

سلێمانی / شەقامی پیرەمێرد

0770 358 7100

0750 106 9589

0748 013 4669

ara.m@hotmail.com

# گفتوگۆیەک سەبارەت بە

# حەقیقەت

نووسینی

**پ.د. عەلائەددین باشار**

وەرگێڕانی

**حەسەن حەمەکەریم**

چاپی یەکەم

١٤٣٣ ك — ٢٠١٢ ز

#  گفتوگۆیەك سەبارەت بە حەقیقەت 

ڕۆژێکیان سەردانی کتێبخانەی دۆستێکم کرد.. ئەو بە مامەڵەو گفتوگۆ لەگەڵ کڕیارەکانیدا خەریکی کاری خۆی بوو، منیش لەولاوە تابلۆیەکی نازدارو دڵکێش سەرنجی ڕاکێشابووم و نوقمی دیمەنەکانی بووبووم.. چیاکان تا لوتکەی سەری سەرەوە بە بەفری سپیو سۆڵ داپۆشراونو بریسکەیان دەهات.. لە دامێنیاندا ئاوی جۆگەلەکان چۆڕاوگیان بەستبوو، بە تیشکدانەوەی خۆر تیایاندا ڕەنگی ئاڵتونیان لێ نیشتبوو، لای سەرەوەی جۆگەکان بە داری سنەوبەرە بالابەرزە شۆخ و شەنگەکان داپۆشرا بوو، لە دامێنیشیدا چین چین گژوگیاو گوڵ و گوڵزار بەدەم شنەی باوە لەنجەو لاریان دەکرد.

ئەم دیمەنە نموونەیەکی بچکۆلەی جیهانێکی گەورە بوو... منیش وەك یەکێك لە ملیارەها خەڵك لەو دیمەنە ڕامابووم و بەخۆمم دەگوت:

ئەم دیمەنە بەشێکە لە بوونەوەر، منیش بەشێکم لە جیهانی مرۆڤایەتی...

پاش ئەوەی کڕیارەکان یەکەیەکە چوونە دەرەوە، هاوەڵەکەم لەسەر کورسیەکەی دانیشتەوە و داوای لێبووردنی لێ کردم کە لێی نەپرسیمەوە...

لەناو کتێبخانەکەدا کەسێکی تر نەمابوو جگە لە سێ کەس: ئەو و من و کوڕێك کە کتێبی سەر ڕەفەکانی ئەمدیو ئەو دیو دەکرد... ئەو کوڕە کراسێکی تەنکی بریسکەدارو پانتۆڵێکی دەڵپو فراوانی لەبەردا بوو... جلەکانی تەواو جیاواز بوون لەگەڵ جۆری گەڕان و پشکنینی کتێبەکان...

ئەوەندەی پێ نەچوو ئاوڕی دایەوە و بەرەو مێزەکەی لای ئێمە هات.. حەپەسام.. خۆ ئەوەی کە من بەکوڕم دەزانی کچێکی گەنجە..

پرسیارێکی لە هاوەڵەکەم کرد ئەوەندەی تر سەرسامی کردم، وتی:

پەڕاوێکم دەوێت کە باسی کاکڵەی حەقیقەت و مەبەست و ئامانجی ژیان بکات... ئایا دەتوانی پیشانمی بدەیت؟

هاوەڵەکەم لای کردەوە بەلای منداو داوای ڕاو بۆچوونی منی کرد لەو بارەیەوە:

منیش سەرەتا پیرۆزبایی گەرمم لەو کچە گەنجە کرد کە بایەخ بەو بابەتە دەدات، پاشان پێم وت:

– ئەوە گرنگ نیە کە ئەو کتێبەت دەست بکەوێت یا نەکەوێت، ئەمڕۆ نا سبەی هەر دەستت دەکەوێ، بەڵام کەسانی وا هەن کە تەمەنیان دەگاتە حەفتا بۆ هەشتا ساڵ کەچی ئەم پرسیارە بە بای

خەیاڵیاندا نایەت، دوای بەسەربردنی ئەو هەموو تەمەنەش جگە لە ئاهو پەژارەو حەسرەت هیچی تریان لەدەست نایەت.

ئەمجار هەڵسامەوە و لەسەر یەکێك لە ڕەفەکان کتێبێکم هەڵبژاردو دام بەدەستیەوە و پێم وت:

– ئەم پەڕاوە بە وردی و بایەخەوە بخوێنەوە... ئەگەر پێویستی کرد کتێبی تریشت پێ پیشان دەدەم.

لەو کاتەدا کە هاوەڵەکەم کتێبەکەی لەناو زەرفدا بۆ دەپێچایەوەو ئەیدایە دەستی، کچەکە لێی پرسیم:

– ببورە! ئایا دەتوانم پرسیارت لێ بکەم ئاخۆ پیشەی تۆ چییە؟

پێش ئەوەی وەڵامی بدەمەوە هاوەڵەکەم ناو و پیشەی منی پێ وت.

ئەو لاوە نەختێ سەری داخستو چاوی بڕیە بەردەمی خۆیو نوقمی بیرکردنەوە بوو، ئەوجا بە چاوێکی پڕ لە دڵەڕاوکێ و سڵ کردنەوەوە لای کردەوە بۆ لام و وتی:

– نازانم.. نازانم چۆن بڵێم...

ئەوجا بێدەنگ بوو.

منیش بەزمانی دڵخۆشکردنو هاندانەوە پێم وت:

– هیچ دوودڵ مەبە.. من بەبرای گەورەت بزانە.. بگرە ئەگەر پیشەکەم – کە وانەبێژم – ڕەچاو بکەیت وەك باوکت وام.. جا

ئەگەر بتوانم سوودێکت پێ بگەیەنەم ئەوا زۆر خۆشحاڵ دەبم لە پێشکەشکردنی هەر هاوکاریەك بۆت:

ئەمجارەیان نەختێ سیمای شادمانی کەوتە سەر ڕوومەتی و ئاهێکی هاتەوە.. بەڵام هێشتا نەیدەتوانی بەسەر دوو دڵیەکەیدا.. زاڵ ببێت پێم وت:

– مادام حەز دەکەیت هەندێك شت فێر ببیت... مادام پێت وایە کە من دەتوانم لە چارەسەرکردنی هەندێك لە کێشەکانتدا هاوکاریت بکەم ، ئەوا پێویستە یەك بەیەکی پرسیارەکانتم لێ بکەیت، تەنانەت ئەگەر من لە ئاستی گومانی باشی تۆیشدا نەبم.. دەبێ کێشەو گرفتەکەتم بەهەموو تان و پۆکانیەوە بۆ باس بکەیت ئەگینا من ناتوانم سوود بە تۆ بگەیەنم.. من لافی ئەوە لێنادەم کە بتوانم وەڵامی هەموو پرسیارەکانت بدەمەوە، بەڵکو دەتوانم یارمەتیت بدەمو ئەوەش فێر ببم کە نایزانم، یان لانی کەم ناوی ئەو کتێب و سەرچاوانەت پێ بڵێم کە بتوانی بگەڕێیتەوە بۆیان.

ئەمجارەیان کە نیشانەی ئاسوودەیی پێوە دیار بوو.. وتی:

– بەمزوانە ئەم شارە بە جێ دێڵم... ئێستا چاوەڕێی ئەوەم کە واژووی پەسەندکردنی بڕوانامەکەم بکرێت، جا ئەگەر پرسیارەکانم بنوسم و بیاننێرم بۆ ئەم کتێبخانەیە، ئایا دەتوانی وەڵامەکانیم بۆ بنێریتەوە؟

پێم وت:

– ئەوەی لەتوانامدا بێت دەیکەم.

بەدەنگێکی کاریگەرو ئومێد بەخشەوە سوپاسی کردم و ئەوجا بەرەو دەرگاکە ڕۆیشت و وتی:

– لەئەمانی خوادا بن !

پێش دەرچوونی وەستاندم و پێم وت:

– بە یارمەتیت کەمێك بوەستە.. باسێك هەیە دەمەوێ بە کورتی ئامارەی بۆ بکەم، هیوادارم ببێتە خاڵی پاڵپشتو کەوتنە گەڕی بیرکردنەوەت، ئەو باسەیشت بە ئیزنی خودا بە درێژتر بۆ دەنووسم... پاشان پەنجەم بۆ تابلۆ هەڵواسراوەکەی سەر دیوارەکە راکێشاو وتم:

– ئایا دیمەنی ئەو تابلۆیە دەبینی؟

– بەڵێ.

– ئایا چیاکانی ناوی چیای ڕاستەقینەن، دارەکانی ناوی داری ڕاستەقینەن؟

– بەڵێ.

پاشان وتی:

– ئەوە دیمەنێکی فۆتۆگرافیە... وەك تابلۆیەکی زەیتی نییە.

– قسەی تۆیە... تەنانەت ئەوەتا بە بچووکی لە ژێریدا ئامارە بۆ شوێنی ئەو وێنە فۆتۆگرافیە دەکات. خۆ ئەگەر بڕۆی بۆ ئەو شارە ئەوا دەتوانی لەسەر گیاکەی و لە ژێر سێبەری دار سنەوبەرەکانیدا

دانیشـیت و ئـەو چـیاو شـیوو دۆڵانـە ببینیـت و لێیـان ڕابمێنـی... وانییە؟

زۆر بە هێواشی و ڕامانەوە سەری ڕەزامەندی جوڵاندەوە.

– ئێستا گریمان ئەم جێگەیە سەدان تابلۆی زەیتی تێدایە... ئایا دەتوانین بـە چـیا و دار و جۆگـە و مێرگـەکانی ئـەو تابلۆیانـە بڵـێین ڕاستەقینەن؟ ئایا دەتوانین لەژێر سێبەری دارەکانیدا بحەوێینەوە؟

لەچـاوانیدا بریسـکەی ئومێـدێ دەرکـەوت کـە لـەم سـەردانەیدا زانیاریەکی دەست کەوتبێ، وتی:

– نەخێر...

– هەرچی قسەیەك کە دەکرێت، هـەر بـیرو هزرێـك کـە دەخرێتـە پێش چاو هەر بەو جۆرەیە، یان ئەوەتا پشتی داوە بە حەقیقـەتێکی دیاریکراوەوە یاخود دەرەنجـامی قەناعـەتێکی شەخسـیو بەرهـەمی بیرکردنەوەی خودی ئـەو قسـەکەرەیە. کەواتـە دەبـێ حەقیقـەتێکی وەها جێگیر هەبێت تا هزرو بیرەکان لێیەوە نزیکتر بن ڕاست بن، تـا لێیشی دووربن هەڵە بن... حەقیقـەت ناگۆڕێـت... ئەگـەر بگۆڕدرایـە هەرگیز نەدەبووە حەقیقەت.. کەواتە ئەم حەقیقەتە جێگیرە نەگۆڕە لـە کـوێ بدۆزمـەوە کـە هـەموو بـیرو بۆچـوونەکان بـە گـوێرەی ئـەو کێشانە دەکرێت؟ بەش بەحاڵی خۆم زۆر حەز دەکەم بە جـددی بـیر لەم بابەتە بکەیتەوە، بۆیە پێم وایە کە زۆر بەکەڵك دەبـێ بـۆ لەیـەك گەیشتنمان.

گەنجەکە ساتێك چاوەکانی بڕیە ئەو تابلۆیە، هەروەك بڵێی پەیوەندی ئەو بەو تابلۆیە تەنها بۆ تەماشاکردن بێت... بەڵام ئەو لە جیهانێکی تردا نوقم بوو بوو... پاشان بێ ئەوەی هیچ ڕایەکی خۆی دەربڕێ دووبارە سوپاسی کردمەوەو کتێبخانەکەی بەجێ هێشت.

ئەو ڕۆژە ئەو دیمەنە پڕ بە پەندو عیبرەتە تا شەوێکی درەنگ لەبەرچاومدا مایەوە... بۆ ڕۆژی داهاتووش دیسان چەند جارێك ئەو ڕووداوە بە خەیاڵمدا هاتەوە.

بەخۆمم دەوت:

– ئەوە گرنگ نییە کە ئەو چی دەپرسێ و منیش چ وەڵامێکی دەدەمەوە... گرنگ ئەوەیە کە سەدان لاوی نموونەی ئەو هەن لە ڕۆحیاندا چەندەها ئازار و بێزار کەفو کوڵیانە، کەسیش نییە دەستی چاودێری و هاوکاریان بۆ درێژ بکات و برینەکانیان سارێژ بکات.

– با بڵێین من بە کتوپڕ و بە ڕێکەوت تووشی ئەو لاوە بووم، خۆ ئەگەر دەرمانێکم شك ببردایە بۆ دەرد و گرفتەکانی دەبوو من بە دوای ئەودا بگەڕێم و بیدۆزمەوە.. ئەمە تەنها سەبارەت بەخۆم نالێم بەڵکو بە هەموومان و بە بەرپرسانیشی دەڵێم.. ئایا ئەرك و کاری ئێمە نییە کە هێندەی بایەخدانمان بە پیس بوونی ژینگە بایەخ بە گرفتە دەروونیەکانی لاوانیش بدەین؟ ئایا لا نەکەینەوە بەلای سەرسامی و هەژانی لاوەکاندا و فەرامۆشیان بکەین تا ئەوکاتەی

کەلە دنیای سەفاهەت و پووچی و بێ مێشکیدا نوقم دەبن، یان دەکەونە ناو گۆمی ئاژاوە و بەرەڵڵاییەوە؟

لەدڵی خۆمدا ساتێك خۆمم خستە جێگەی ئەو گەنجە... تاکە خواستی خێزانەکەی بۆ ئەو ئەوەیە خوێندن تەواو بکات، ئەو دامودەزگایەش کە ئەو لاوە کاری تیا کردووە هەر هەمان خواستی هەبووە.. بەڵام کێشە دەروونیەکانی.. بیروباوەڕی.. مەعنەویاتی.. هەموو ئەمانە چ بەلای خێزانەکەی و چ بە لای سەرکارەکانیەوە هیچ بایەخێکی ئەوتۆیان نییە.

کەواتە ئەی کێ بایەخ بەوە دەدات؟ ئایا سبەینێ ڕووبەڕووی پرسیارەکانی دەبمەوە؟ یان لەم پرسیارانەدا بڕوانامەی سەرکەوتنی هەندێ لەو ناوەندانە دەبینم کە بە مەبەستو پلان و نەخشەوە ئەم لاوەیان پاڵ ناوە بەرەو ئەو سەرسامی و دڵەڕاوکێی و شڵەژان و کەساسیە؟

بەخۆمم وت:

– بەهەرحاڵ ئێستا کاتی ئەوە نییە بیر لەم جۆرە کارانە بکەمەوە، چونکە ئومێدی هیچ سوودێکیان لێ ناکرێت!

دیارە وەستان لەسەر ئەوەی تێکڕای کۆمەڵگا چاك ببێت بۆ ئەوەی کوڕێك یان کچێکی لاو ڕزگار بکرێت ئەوە کات بەزایە دانە، ئەی باشە کۆمەڵگە چییە؟ ئەی لە تاکەکان پێك نەهاتووە؟ کە

کوڕێك یان کچێك چاك ببێت ئایا ئەوە ناگەیەنێ کە لە پەنجا ملیۆن کەس، تاکێك چاك بووە؟[1]

ئەم بیروبۆچوونانەو نموونەی ئەوان تا سبەینێش هەر بیریان دەگوشیم و بەریان نەدەدام. دەوامی ڕەسمی تەواو بوو، منیش ڕووم کردە کتێبخانەی هاوەڵەکەم و لێم پرسی:

– هیچ هەواڵێك هەیە؟

– بە بزەو خەندە شیرینەکەیەوە کە هەمیشە لەسەر لێوانی بوو وتی:

– بەڵێ، بەڵێ... نامە چاوەڕوانکراوەکە هاتووە.

نامەکەی چوار پەڕە بوو... نامەیەکی سکاڵاو دادو بێداد بوو، هەر دێڕێکی حەزێکی پاکژی لێ دەچۆڕا بۆ ئەوەی بگات بە حەقیقەت.

ئەو کچە لەبەشێکی نامەکەی دا دەڵێت:

برای گەورەو بەڕێزم!

وا بڕوانامەی دەرچوونم وەرگرتووەو پاش چەند سەعاتێك ئەم شارە بەجێ دەهێڵم... وەك مامۆستای فەلسەفە دادەمەزرێمو دەبم بە فەرمانبەر... بەڵام ئەوەی کە لەم بابەتەدا سەیرو سەمەرەیە ئەوەیە کە من تائێستاش هیچ یاسایەکی فەلسەفی تایبەت بە خۆمم پێك نەهێناوە... کەواتە کە ئەمە حاڵی خۆم بێت دەبێ بتوانم چ شتێك فێری کەسانی تری بکەم؟ من لەم کارەی خۆم سەرسامم:

---

١– دانیشتوانی ئەوکاتەی تورکیا (١٩٨٩) پەنجا ملیۆن کەس بووە.

شوێن چ فەیلەسوفێك بکەوم؟ هەموو فەیلەسوفێك دەبینم دەڵێی لەبەر دەممدا ڕاوەستاوە و بۆلای خۆی بانگم دەکاتو دەڵێ: "حەقیقەت لای منە.. وەرە بۆ لام" پاشان دەبینم هەر فەیلەسوفێك ڕێگەو فەلسەفەی ئەوانی تر هەڵدەوەشێنێتەوەو پووچی دەکاتەوە، بەم شێوەیە بە سەرسامی لە نێوانیاندا مامەوە... پاشان بەخۆمم وت: کەواتە پرسیار لە بیرو بۆچوونی مامۆستایانی فەلسەفە دەکەم...

ئەوەم کرد و زانایانی دیکەیشم بینی، ئەمەیان کتێبێکم پێ دەدا! یەکێکی تر ئامۆژگاریم دەکات کتێبێکی تر بخوێنمەوە... بینیم کە هەموو ڕاو بۆ چوونەکان دژ بەیەك و جیاوازن... بە هەرحاڵ وا خوێندنم تەواو کرد و لەو کەشوهەوایە ڕزگارم بوو.

لە بەشێکی تری نامەکەیدا سکاڵایەکی تفت و تاڵ لە دەست کۆمەڵگە دەکات و دەڵێ:

"..ئەم کۆمەڵگایەش بۆ خۆی جۆرێکی تری پاشاگەردانی و ئاژاوەی فەلسەفیە... هەر توێژە و ڕوانینێکی تایبەت بەخۆی هەیە بۆ ژیان. ئەوەی لای یەکێکیان سپی یە لای ئەوی تر ڕەشە... بڕیار دەدەم کە بەوجۆرە ڕەفتار بکەم کەچی لەلایەن توێژێکی دیاریکراوی کۆمەڵگەوە توانجو ڕەخنەم ئاڕاستە دەکرێ... هەر کات بەجۆرێکی جیاواز ڕەفتار بکەم لە لایەن توێژێکی ترەوە ڕەخنەم ئاڕاستە دەکرێ..."

له نامەکەیدا لێی پرسیووم:

– لەناو هەموو ئەمانەدا حەقیقەت کوانێ؟ داوات لێ دەکەم یارمەتیم بدەی... لەدڵی خۆمدا بە خۆم دەڵێم: واز لە هەموو ئەوانە بێنەو گوێ بە هیچ مەدە. تۆ چیت داوە لەم کارانە؟ بەڵام خێرا هەرئەوەندە دەزانم بێ ئەوەی ئاگام لەخۆم بێ کەوتومەتە ناو ئامێزی فەلسەفەیەکی ترەوە.

لەنامەکەیدا بەردەوام دەبێت و وێنای دنیای ناوەوەی خۆی دەکات و دەڵێ:

– بەڕاستی دڵ و ناخم بوونەتە سەکۆی مەیدانی جەنگی شتانی دژ بەیەك... جارێك مەیل دەدەم بەملاداو جارێکیش بەولادا، جاری وایش هەیە وا هەست دەکەم کە لە بۆشاییەکدا هەڵواسراوم، هەر شتێك دەبینم پووچ و بێ بایەخە و شایانی ئەوە نییە لای بۆ بکرێتەوە: دنیا... ژیان... قسە... بێدەنگی... گریان... پێکەنین... هەموویان... هەموویان... بەپووچ و بێ مانا دەبینم...لەبەر خۆمەوە دەڵێم هەموویان تەمسیل و یاری منالآنەن...

بیرو هزرەکان لەمێشکمدا ململانێ و زۆرانبازی دەکەن و پێکدا دەدەن... هیچ بیرۆکەیەك لە مێشکمدا جێگیر نابێت، نامەیەت، ناگیرسێت، بەڵکو خێرا جێگە بە خۆی چۆڵ دەکات بۆ بیرۆکەیەکی تر و ئۆقرەی نییە... بەو جۆرە تامی ئاسوودەیی و دڵنیاییم لەدەست داوە...

له خوێندنەوەی هەر دێڕێکی نامەکەیدا هەستم بەوە دەکرد کە بەدەست کێشەیەکی جیاو خەمێکی ترەوە دەناڵێنێ...

لەدوا لاپەڕەی نامەکەیدا چەند باس و خواسێکی زۆرو جۆراو جۆری تۆمار کردووە:

—مرۆڤ چییە؟... ئەرکی چییە؟

—ئایا بڕوات هەیە بە ئەگەری یەکسان بوونی نێوان ژن و پیاو؟

چەندەها پرسیاری تریش...

نامەکەی بە برگەیەکی پڕ لە ڕێز و پێزانین کۆتایی دێنێت و ئیمزای (لەیلا) دەکات...

لەدڵی خۆم دا وتم:

—تەنیا نامەیەك بەس نییە بۆ وەڵامدانەوەی ئەو هەمووە پرسیارە.. بەڵام پێویستە شتێك بنووسم.

ئەو ناونیشانەی ئەم کچە دابووی دەگەڕایەوە بۆ ژنە مامۆستایەك چونکە کچەکە وای بەگونجاو زانیبوو لە ڕێگەی ئەوەوە نامەکان وەربگرێت... پاشان بۆم دەرکەوت کە (لەیلا) ناوی ڕاستەقینەی ئەو نییە.. جا نازانم بۆچی ئەو ناوەی هەڵبژاردبوو؟

پاش وەرگرتنی ئەم نامەیەی لەیلا، بۆ ماوەیەك خۆم سەرگەرمی خوێندنەوە و بەسەرکردنەوەی پەڕاو و گۆڤارەکان کرد بەتایبەتی ئەوانەی بایەخ بە کەیس و باسی ژن دەدەن. هەروا نامەی

خوێنەرەکانم دەخوێندەوە و پەیوەندیم بە لێپرسـراوانی هەنـدێ لـەو گۆڤارانە دەکرد و زانیاری زۆر و زەبەندم لێ وەرگرتن.

لەمانەوە گەیشتمە ئەو ئاکامەی کە ئەو کێشەیەی لـەیلا گرفتـاری بـووە، هـەمان ئـەو کێشـەیە کـە توێـژێکی گـەورەی کۆمەڵگـە بەدەستیەوە دەناڵێنـێ، بـەڵام ئـەوان نەیانـدەتوانی وەك لـەیلا بـە ڕەوانی و ڕاشـکاوانە گرفتەکـەیان بخەنـە ڕوو. نەیانـدەتوانی ئـەوەی لەناو سنگیاندا پەنگی خواردووەو گینگڵ دەدات دەری بخەن.

پـاش ئـەم قەناعەتـە بـیرم لـەوە کـردەوە وەڵامـەکانی لـەیلا لـە ڕێگەی گۆڤارێکـەوە بـڵاو بکەمـەوە، بـەڵام یەکسـەر ئـەو بیرۆکەیـەم خستە ئـەو لاوە و بـەخۆمم وت: ئەگـەر ئـەو وەڵامانـە بڵاوبکەیتـەوە دەبێ هەموویان بەجارێ بڵاوبکەیتەوە... هەروەها دەبـێ مۆڵـەت لـە لەیلایش وەرگری...

بەو جۆرەش بوو...

نامەی یەکەمم بۆ نووسی و پێم وت:

بەناوی ( لەیلای عەودالّی حەقیقەت )ەوە قسەت لەگەڵ دەکەم:

بێگومان خۆت دەزانی هەر پرسیارێکی ناو پرسیارەکانت دەکـرێ ببێتـە بابـەتی وانەیـەك یـاخود نامەیـەکی توێژینـەوە یـا نووسـینی کتێبێك... من لەم نامەیەدا ئاماژە بە هەندێکیان دەکەم.

هیوادارم یەکەم جـارو پـێش هـەموو شـتێ ئـەوە بزانیـت کـە: ژن مرۆڤـە... لەبەرئـەوەی کـە مرۆڤـە چـەندەها ئـەرك و فـەرمانی لـە

ئەستۆدایەو پێویستە پێیان هەڵسێت... چەندەها حەقیقەت هەیەو ئەركی سەرشانیەتی كە بیاندۆزێتەوە. ئەرك و بەرپرسیارێتی ئەویش وەك ئافرەتێك دوای ئەوە دێت... بۆیە من لەم خاڵەوە دەست پێ دەكەم...

كاتێك دەست دەكەم بەوەڵامی پرسیارەكانت بە گوێرەی زنجیرەی ڕیزبەندی ناو نامەكەت وەڵام نادەمەوە، بەڵام كاتێ هەموو نامەكانم تەواو كرد ئومێدی ئەوە دەكەم كە گەیشتبینە خاڵێكی دیاریكراو... ئیتر لەوەدوایش دەگەڕێتەوە بۆ خۆت و لێوەشاوەیی و ڕەنج و ماندووبوونت.

با ئەم نامەیە تەنیا نامەی ( دەمەتەقێ ) و گفتوگۆ بێت، نامەی دووەم تایبەت دەكەم بە پرسیاری: حەقیقەت چییە؟ بەڵام ئێستا پێشنیارێكت بۆ دەكەم:

وا بیر بكەرەوە كە تۆ لە ساتەوەختێكی ناكاودا هاتبیتە دنیاوە.. دنیا كش‌و ماتەو ئارامی‌و بێدەنگی باڵی بەسەر هەموو لایەكی زەویدا كێشاوە.. لەم دنیایەدا جگە لە تۆ هیچ شتێكی تر بوونی نییە.. لەكاتێكدا كە تەواو سەرسامیت و نازانی چی بكەیت دەبینی لە نزیكتەوە زەوی درزی برد و دارێكی لێ هاتە دەرەوە و خێرا گەشەی كرد و گەورەبوو، سێبەری پەیداكرد... ئەمجا لەنێوان لق و پۆكانیدا بەروبومی گرت... تۆش ئەو بەروبومانەت لێكردەوە و خواردت..

پاش کەمێك بە ئەسپایی ئاژەڵێك لێت نزیك بووەوە و گوانەکانی پڕبوون لە شیر.. تۆش شیرەکەت دۆشی و خواردتەوە... گریمان تۆ حەزت لە گەڕان و سەیر و سەفا بوو، دەست و برد وڵاخێکی تر لەدوورەوە بە هەڵکەهەڵك هات و لەبەردەمت دا وەستا تا سواری ببی، تۆش سواربویت و نەختێ گەڕای بەدەرودەشت دا..

ئێستا دەمەوێ لێت بپرسم: ئایا دەتوانی ئەم هەموو کارانە بکەیت و هیچ سەرسام نەبیت یان سەرت سوڕنەمێنێ هەروەك کارێکی سروشتی و ئاسایی ڕوویدات؟ ئایا لەنێوان خۆت و دەروونتدا ناپرسیت: ئەمە چییە ڕوودەدات؟ ئایا بەم ڕووداوانە تووشی دڵە تەپە نابیت؟ ئایا لە یەکەمینی کارو ئەرکەکانت ئەوە نابێ کە خاوەنی ئەم هەموو جوامێریو بەخشندەییە بناسیت تاکو بە ئەرکی سوپاسگوزاری و پێزانینی خۆت هەڵسی؟

با ئێستا باسی ئەگەرێکی تر بکەین:

گریمان تۆ خۆت بە تەنیا نیت، بەڵکو هەزاران و سەدان هەزار کەس... بگرە تێکڕای دانیشتوانی ئێستای گۆی زەوی لەدەورتدان، گریمان ژمارەی گیانداران و ڕووەکەکانیش زیادیان کرد تاگەیشتنە ژمارەی ئێستایان.

پرسیار دەکەیت:

—ئادەی چی گۆڕا؟ ئەوە بۆ ئێستا هیچ هەست بەسەرسامی و حەپەسان و هەست و نەستی پێزانین و حەزی سوپاسگوزاری ناکەم

وەك ئەو کاتەی کە بەتەنیا بووم هەستم دەکرد؟ ئایا ئاسایی‌و چاوەڕوانکراو نەبوو کە سەرسامی‌و حەپەسانم زیاد بکات؟ ئایا ئەو هەموو تەلارە بەرزانەی کە باوەشیان کردووە بە حەوادا و جەنجاڵی خەڵکی زۆر و ژاوەژاو و پاگەندە و بگرەو بەردەی خەڵك و ڕاکردن بەدوای پارووی ژیاندا بوونەتە پەردە و بەربەست لەبەردەم بیرکردنەوەی مندا؟

بەڵێ خوشکی عەودالی حەقیقەتم! ئەگەر نەختێ رابمێنی دەبینی ئەو مرۆڤەی کە لە هەر کۆمەڵگەیەکدا دەژی بەهۆی ئەو کۆمەڵگەیەوە پێداویستیە گرنگەکانی دابین دەکات.. ئەگەر لە گۆشەیەکی ترەوە لێی ورد ببینەوە دەبینین کە ئەو مرۆڤە خۆی بەتەنیا دەژی: خۆی بەتەنیا هاتووەتە دنیاوە و لە ژان‌و ئازارەکانی کاتی لەدایك بوونیدا کەس بەشداری نەکردووە، بۆیە لەگەڵ یەکەم هەنگاونانی بۆ ئەم دنیایە دەستی دایە گریان، هەر مرۆڤەی لەم دنیایەدا جیهانێکی تایبەت بەخۆی هەیە و لەو جۆرە جیهانەدا گوزەران دەکات... کاتێکیش دەمرێت بە تەنیا دەچێت بۆ ناو گۆڕ، کەسیش لەتەکیدا ناڕوات... لە قیامەتیشدا کاتێ حەشر دەکرێت بەمانایەکی تر خۆی تەنیایە، چونکە وەك هەموو ئەو خەڵکە حیسابی ئەو کردارانەی لەگەڵدا دەکرێ کە لەژیانی دنیایدا ئەنجامی داون...

کاتێك ئەو مرۆڤە دێتە دنیاوە هەنگاوە سەرەتاییەکانی ژیانی زۆر بە ئاسوودەیی و بێخەمیەوە لە ماڵی باوکیەوە دەست پێ دەکات.. لەلانکەکەیدا دەنوێ، شیرەکەی دەخوات، هیچ شتێك بێزار و وەڕسی ناکات، کە گەورە بوو کەوتە سەرپێ، یەکەمجار بەناو ژوورەکانی ماڵەکەیاندا دەگەڕێ پاشان بەناو کۆڵانەکان و جادەو شەقامەکانی گەڕەکەکەیان و پاشتریش بەبازاڕەکاندا دەگەڕێ.

خۆی بە تەنیا دەنوێ، خۆی بە تەنیا خەونەکانی دەبینێ، خۆی بە تەنیا لەخەو هەڵدەستێ، چ ئەو کەسە زۆرانەی کە لەخەونییدا دەیانبینێ و چ ئەو دۆست و هاوەڵە زۆرانەیش کە لە کاتی بێتاقەتیو بێزاریدا هاوەڵێتی دەکەن، ناتوانن تەنیایی ئەو نەهێڵن.

کاتێ لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەی لەسەر سفرەی خواردن دادەنیشن لەگەڵیان نان دەخوات، بەڵام تەنیا سکی خۆی تێر دەکات. کاتێکیش کاردەکات بەهێزوو بازوو و وزەی خۆی کاردەکات..

بەڵێ! پێویستە لەسەر مرۆڤ بچێتە ناو کۆمەڵگەوە، هاوبەشی ژیانی کۆمەڵایەتی بکات، بەوەش پێداویستیە زۆرەکانی دابین و تەسەل بکات، ئەوە چارەنووسی مرۆڤە، ئەوەش سروشتی لەش و لاری ئەو و نەخش و شێوەی بەدیهاتنێتی. بەڵام پێویستە لەسەری لەناو ئەو کۆمەڵگەیەدا نەتوێتەوەو، لەناو گێژاو و جەنجاڵی

کارەکانـدا کەسـێتی و قـەوارەو بـوونی خـۆی ون نـەکات... دەبـێ هەمیشەو هەردەم ئەوە لە پێش چاوی خۆی دابنێ.

دەبێ چاك بزانێ کە هەموو ئەو کەسانەی لەم جەنجاڵیـەی ژیانـدا دەیانبینێ، یەك بە یەك کۆچ دەکەن بەرەو گۆڕ. پاش سەد ساڵی تـر تاقە یەك کەس لە خەڵکی ئەم سـەر زەمینـە ( کـە ئێسـتا ژمارەیـان دەگاتە زیاتر لە پێنج ملیار) نامێنن، تەنانـەت منداڵـە تـازە لـە دایـك بووەکانیش لەژیاندا نامێنن.

هەر مرۆڤێك کە بە تەنیا دێتە دنیاوە و هەر بـە تـەنیایش بـەجێی دەهێڵێـتو دەڕوات بـەرەو گـۆڕ لـەکاتی گیانـەڵاو گیـان سـپاردنیدا هـەموو خـەڵکی تـر بـەردەوام خـەریکی ئـیش و کـاری خۆیـانن... خەریکی گەمەو یاری خۆیانن، جگە لە هەندێ لە خزم و کەس و کـار کە بەدەوری جێگەکەیدا دانیشتوون کەسی تر نابینیت..

ئێستا وەرە بەخەیاڵ خۆت لەو هەموو خەڵك و جەنجاڵیە دابڕنـەو بگەڕێرەوە بۆ تەنیاییەکـەی خـۆت.. بـیر لـە ئەندامـەکانی نـاوەوەی جەستەت بکەرەوە: هـیچ ئەنـدامێکی لەشـت بـە ویسـت و ئـارەزووی خۆی ئەو کـارو فرمانـە ئـەنجام نـادات کـە خراوەتـە ئەسـتۆی، هـەر ئەنـدامێك زۆر بـە وردی و جـوانی ئـەرکی خـۆی ڕادەپـەڕێنێت، بـێ ئەوەی بزانـێ ئەندامـەکانی تـر چ کارێـك دەکـەن، بگـرە بـێ ئـەوەی بزانێ خۆی خەریکی چییە، تۆش لێکەڕاوی ئەو ئەندامانە بـۆ خۆیـان کاربکەن و هەموو دیدو سەرنجی خۆت تەنیا بۆ ئـەو کارانـە ئاڕاسـتە

دەکەی کە لەدەرەوەدا دەیانکەیت، دەخوێنیتەوە، بیردەکەیتەوە، یاری دەکەی، پێدەکەنی... بیر لە هاتنە دنیای خۆت بکەرەوە.. ئایا وەك ئەو سەفەرەت وایە کە لە دەڤەری شار و خزم و کەس و کاری خۆتەوە هاتوویت بۆ ئەم شار و زانکۆیەی ئێرە؟

ئایا پێشتر دەتزانی کە تۆ چی دەبیت و لە چ ڕەحمێکدا پەیدا دەبیت و سەر بە چ ماڵێکدا دەکەیت؟ نەدایك و نەباوکت تۆیان بانگ نەکردووە بۆ ئەم دنیایە، تا ئەو ساتەیش کە لەدایك بووی نەیاندەزانی تۆ کێیت.. ڕاستە ئەوان چاوەڕێی میوانێك بوون، بەڵام ئەو میوانە کێ یە؟ کوڕە یان کچ؟ قژ زەردە یان ئەسمەر؟ لاوازە یان قەڵەو؟... هیچکام لەم شتانەیان نەدەزانی...

کەواتە کێ تۆی ناردووە بۆ ئەم زێدە، بۆچی ناردوویتی؟ ئەم گۆی زەمینە کە لەسەر کۆڵە پشتیەوە زیادتر لە پێنج ملیار کەسی هەڵگرتووە بەرەو چ ئاڕاستەیەك و بۆکوێ دەڕوات؟ کێ خاوەن و کاپتنی ئەم کەشتیە ئاسمانیەیە؟ ئەم کەشتیە ڕۆژانە سەدان هەزار ڕەوەند وەردەگرێت.. سەدان هەزار کەسیش بەجێی دەهێڵن... هەموو ئەمانە لە کوێوە دێن؟ ئەی بۆ کوێ دەڕۆن؟ سەرەکەی تری ئەم تونێلە کە پێ ی دەوترێ (گۆڕ) بەکوێ دەگات؟

بەڵێ!... ئەمە ئەو پرسیارانەن کە بوونەتە ماخۆلانی مێشك و بیری هەموو مرۆڤێك، هەوڵدان بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەش

یەکەمین هەنگاوە بۆ گەیشتن بەحەقیقەت و ئاسوودەیی و حەوانەوە.

بەڵام سەیر ئەوەیە، دەبینیت بیرو هەڵسوکەوت و ڕەفتاری مرۆڤەکان لەئاست ئەم پرسیارانەدا تەواو جیاوازن، بەشێکیان خۆیان لێکدانەوە و ڕاو بۆچوونەکانی خۆیان لێدەخوڕن، یان کەوتوونەتە دوای لێکدانەوەیەکی هەڵەو بەبێ ئاگایی تێگەیشتنەوە لەبەرخۆیانەوە وەك تووتی دەیڵێنەوە، وەك وردبین و هاوێنەیەکی چاڵ هەڵدەستن بە ئاوەژووکردنەوەی شتەکان و سەرەوە دەخەنە خوارەوە و خواریش دەخەنە سەرەوە، ئەم جۆرە لێکدانەوانەش حەقیقەتی شتەکان لە بیرو زەینی خەڵکدا ئاوەژوو دەکەن و، بە دووبارەبوونەوەشیان زەینەکان عادەتیان پێوە دەگرن و لەگەڵیان ڕادێن، باوەڕیان دێتە سەر ئەوەی کە فیکرو بیرو بۆچوونی خەڵکانی تر هەڵەیە.

بەڵام ئەو هزروبیرانەش ڕۆحی ئەوان تێر ناکەن و تینوویێتیان ناشکێنن و لەم سارای گەردوونەدا وەها دەژین کە هەست بەنامۆیی و تەنیاییەکی سەخت و دژوار دەکەن، ئیدی هەرگیز تامی شیرینی بوونی خاوەن و پەروەردگاری خۆیان ناکەن... عەقڵ و دڵیان لە ئازار و سۆیەکی هەمیشەییدایە، ڕۆحیان هیچ حەوانەوە و نەواو ماوایەکی پشووی دەست ناکەوێ.

هەندێکیشیان هیچ بایەخێك بەم پرس و باسانە نادەن و هەر گوێیشی پێ نادەن، لایەك ناکەنەوە بۆ ئەو خواستو داواکاریانەی کە عەقڵو دڵیانی گوشیووە، بەڵکو فەرامۆشیان دەکەن و دەیانخەنە ئەولاوە و خۆیان مەست و نوقمی ژیانی گاڵتەو گەپ و گەوجیو کەودەنی دەکەن و ژیانیان بەشتی بێ سوود و گوێگرتن و وتنەوەی هەواڵ و قاوە باوەکان و دەمەدەمێی بەتاڵ دەکەن.

نموونەی ئەم جۆرە کەسانە وەك ئەو کەسە وەهان کە هەوڵ دەدات لە ڕێگەی بیر نەکردنەوە لە برسێتی یەوە بگاتە تێر بوون. بەڵام ئەو ڕێ و تەگبیرە تەگبیرێکی کاتی و بێ سوودەو ناتوانێ پێداویستیەکانی ڕۆح تێر بکات.

دەبینی ئەم جۆرە کەسانە لەبەردەم هەر دەرد و بەڵایەکی بچوکدا چۆك دادەدەنو شکست دێنن، ئەگەر قەدەریش بۆ تاقیکردنەوە بەڵایەکیان بۆ بنێرێ دەست دەکەن بە هاتو هاواری یاخیبوونو سەرپێچی کردن. ئەگەر راستت دەوێ ئەو جۆرە کەسانە لە ڕووبەڕوو بوونەوەی حەقیقەتو بیرکردنەوە لە حەقیقەت دەترسن، چونکە وا دەزانن ئەگەر کەمێك بیر لەم ژیانەو لەم جیهانەو مردنو ئەوەی لە پاش مردن دێت بکەنەوە، ئەوا ژیانیان لێ تاڵ دەبێتو ئاسوودەییان لەدەست دەچێ.

ئەو جۆرە کەسانە کە بە هەڵپەو پەرۆشەوە خۆیان دەخەڵەتێنن، کاتێـك لـە کـۆڕ و کۆبوونەوەیەکـدا پێکـەوە دادەنیشـن بـە یـەکتری دەڵێن:

– گوێی مەدەرێ...

– خۆتی پێوە خەریك مەکە و فەرامۆشی بکە...

بەسەر پشتی ئەم گۆی زەویەوە کە لەسەعاتێکدا بەخێرایی زیـاتر لە سەد هەزار کیلۆمەتر دەسورِێتەوە ئەو جۆرە کەسانە دەژیـن، بـێ ئەوەی بیر بکەنەوە یان نەختێ سـەرنج بـدەن و بـزانن ئـاخۆ بـەرەو کوێ دەڕۆن، چ چارەنوسێك چاوەڕێیان دەکـات؟ سـەیر ئەوەیـە کـە بۆچـوونیان وەهایـە ئـەم گـوێ پێنـەدان و فـەرامۆش کردنـە بـە فەلسـەفەو بیروبـاوەڕ دادەنـێن، هەرکەسـیش کـە زمـانی بسـوتێ و ڕەخنـە لـەم فەلسـەفەیەی ئـەوان بگرێـت، یەکسـەر شـالاّوی قسـەی دەبەنە سەر و پێ ی دەڵێن:

– ئەرێ برا لەم چەرخەدا نازیت؟... باشە تۆ لـە چ سـەردەمێکدا دەژی؟!

ئـا بـەم لاقرتـێ و گاڵتـە کردنـەوە هـەوڵی پـەردەپۆش کردنـی حەقیقەت دەدەن و لێی ڕا دەکەن، بەم خۆخەڵەتاندنەیشـیان نـەختێ هەست بە ئیسراحەت دەکەن. هـەرگیز بـە بیریانـدا نایـەت کـە تـەنیا زەمەن و ئەو خەڵکانە گۆڕاون کـە لەگـەڵی دەژیـن...خـۆ دنیـا هـەر دنیاکەی جارانە، بەهەمان یاساکانی پێشوو ڕادەگوزەرێ... گەلاّکان

هێشتا هەر سەوزن، بەفریش هەروا سپی یە.. شێر گیانداریکی درندەیەو بەرخیش ئاژەڵێکی ماڵی و دەستەمۆیە...

جێی داخ و کەسەرە کە پێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆژیا وای لە مرۆڤ کردووە کە خۆی لەبیر بچێتەوە. خۆ دەبوو بەها باڵاکانی مرۆڤایەتی کە مرۆڤ دەکەنە مرۆڤ سەرەڕای پێشکەوتنی زانستیش لە جێگەی پێشووی خۆیاندا بمێننەوە.

دەبوایە هەر کەسێ بەپاکیی بمێنێتەوە جێی پەسەندی و ڕێز بوایە، کەسی بێ شەرم و بەد ڕەفتاریش لەهەموو سەردەم و سەدەیەکدا بێ ڕێز و ناپەسەند بوایە. بەڵام لەبەر هەر هۆیەك بێت ئەوە ڕووی نەدا...ئەوەتا هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر دەدرێت بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە پێشکەوتنی زانست پێچەوانە دەگونجێ لەگەڵ ڕەوشت و بەها جوانەکاندا.

بەو جۆرە نەوەیەکی لاسایی کەرەوە سەری هەڵدا کە مرۆڤی خۆرئاوایی ڕەوشت نزمی– ئەگەر چی لەزانست و پیشەسازیدا پێشکەوتووە– کردە پێشەنگ و ڕابەری خۆی.

لەلای خۆمان گرۆیەکی سێیەم هەن کە هەوڵی وەڵام دانەوەی ئەو پرسیارانەمان دەدەن، پاش خوێندنەوەو بیرکردنەوەو پرسیارکردن دەگەنە ئەم دەرەنجامە: نە ئەم مرۆڤە جڵەوی بۆ بەرەڵاکراوەو نە ئەم بوونەوەرەیش هەروا بێ خاوەنە...هەموو شتێك لەمیانی پلانی قەدەر و لە ئاکامی بەدیهێنانی بەدیهێنەری مەزنەوە پەیدا بووە.

هەر بۆ نموونە: هەڵهاتن و ئاوا بوونی خۆر...هاتن و ڕۆشتنی هەموو زیندەوەرێك لەم دنیایەدا لەدوو تویێی پلانێکی ورد و یاسایەکی کامڵ و زانستێکی بێ پەی و ناکۆتاوە دەبێت.

خۆر... مانگ... ئەستێرەکان... هەرهەموویان ملکەچو دەردەستی ڕکێفی دەسەلاتێکن، هەر بەو جۆرە مرۆڤو بولبولەکانو گوڵەکانیش... هەموویان پەیڕەوی یاسایەکی دیاری کراون. زاتێکی وا هەیە کە هەر هەموو ئەوان دەنێرێت و دەیانهێنێ بۆ ئێرە، هەر خۆیشی هەموویان دەباتەوەو ئێرە بەجێ دەهێڵن.

هەمان زانست و هەمان دەسەلات و هەمان ویست و ئیرادەو هەمان دانایيە کە ئەو ئەستێرانەی ڕاگرتووە. گەلە ئەستێرەکان بەڕێوە دەبات... کاروباری ئەم مرۆڤە بەڕێوە دەبات.. مەلە بە ماسیەکان دەکات...

بەڵێ لەیلا خان! تۆش پاڵێوراوی تاکو یەکێك بیت لەم گروپی سێیەمە... چونکە بیر دەکەیتەوەو ڕادەمێنی و لێدەکۆڵیتەوە و بەدوادا دەچی و پرس‌وڕا دەکەیتو داوای ڕوونکردنەوە دەکەیت. بۆیە پێویستە چاك بزانی کە ئەمە هەلێکی زێڕینەو پێویستە نرخو بەهای ئەو هەلو دەرفەتە بەباشی بزانیت و بەکاری بهێنیت.

لەم ژیانی دنیایەدا کە بە دڵۆپە ئاوێك دەست بە ژیان دەکەینو بە لاکێك کۆتایی پێ دێنین...لەم ژیانەدا وەکو ڕێبوارێك و میوانی میوانخانەیەك بژی.

بەدوای خۆشیو چێژو ئارەزووەکاندا ڕامەکە... بەڵکو وابکە ئەم ڕۆژانەی تەمەنت واتاو بەهایەکیان بێت... لە جەنگی ئەم ژیانە کورتەدا دەستی هاوکاری لەگەڵ کەسانی تردا تێکەڵ بکە... ڕەنج بدە و خۆت ماندوو بکە... سامان پێکەوە بنێو لێی خەرج بکە... کارێك پەیدا بکەو کاربکە و شوو بکە..کاتێك پیر دەبی خۆت خانەنشین بکە.. بەڵام هەرگیز ئەوەت بەبیردا نەیەت کە بە مەبەستی شوو کردن یان خانەنشین بوون یان بۆ مردن هاتوویتە ئەم دنیایەوە.

پێش ئەوەی کۆتایی بە نامەکەم بهێنم حەز دەکەم ئاماژە بۆ خاڵێکی دیاریکراو بکەم:

ئەگەر پێت خۆشە پەی بە حەقیقەت ببەیتو دەستت لێی گیر ببێ، پێویستە لەسەرت کە خۆت لە کاریگەری دەوروبەرت ڕزگار بکەی، پێویستە وریا بیو نەکەویتە ئەو هەڵەیەوە کە گوایە کۆمەڵگە پێوەری حەقیقەتە، چونکە هەموو جارێ شوێنکەوتنی زۆرینە نامانگەیەنێت بە حەقیقەت.

حەقیقەت بۆ خۆی حەقیقەتە... لە پیادەکردنو شوێنکەوتنی حەقیقەتدا نە تاك تاکێکی خەیاڵی و نە کۆمەڵگاش کۆمەڵگایەکی خەیاڵی و نموونەیی دەبن، ئەگینا حەقیقەت نابێتە شوێنکەوتەی تاك و کۆمەڵ. تۆ چاوێك بگێڕە بە دەوروبەری خۆتدا... ئەوە نیە بوونەوەرە بێگیانەکان زۆر ترن لە زیندەوەرەکان؟ بەڵام ئایا بەهاو نرخی تێکڕای بێگیانەکان دەگاتە پایەو نرخی تاکە مێرولەیەك؟ لە

جیهانی گیاندارانیشدا ژمارەی گیانداران چەندین جار لە ژمارەی مرۆڤ زیاترە... بەڵام ئەگەر هەرچی گیاندار هەیە بەراوردی بکەی ناگاتە بەهای منداڵێکی بچووك.

لەناو گرۆی مرۆڤەکانیشدا دەبینین نەفام و گەوجو نەزانان زۆر زیاترن لە زانایان، بەڵام ئایا هەزاران نەفام سەنگ و بەهای زانایەکیان دەبێت؟

کەواتە تۆیش فەلسەفەی زۆرینە فڕێ بدە ئەولاوە و هەوڵی دۆزینەوە و دەستکەوتنی حەقیقەت بدە.. هەرکاتیش دۆزیتەوە و دەستت کەوت چاك دەستی پێوە بگرەو هەرگیزاو هەرگیز لێی جیاو تەرە مەکەوە............. لەگەڵ سڵاومدا.

******

پاش پانزە ڕۆژ وەڵامم بۆ هاتەوە.. لەنامەکەیدا بەئاشکرا دیار بوو کە دوودڵیەکی تێکەڵ بە ئاسوودەیی تێدایە.. لە جێگەیەکی نامەکەیدا لەیلا دەپرسێت: ( ئایا مرۆڤەکان وەك یەك هەل و دەرفەتیان دەست دەکەوێ بۆ دۆزینەوەی حەقیقەت؟ پاشان دەڵێت: خۆ ئەگەر وەك یەك دەرفەتیان بۆ دەڕەخسێت، ئەی بۆچی هەموویان لەبەرەیەکدا کۆنابنەوە؟ ئەگەر یەکسانو وەك یەکن بۆ دەرفەتەکانیان بۆ نایەتە پێش، ئەمە چۆن ڕوون دەکەیتەوە؟ بەدوای ئەو پرسیارانەیدا ئەم ڕوونکردنەوەیشی فەرامۆش نەکردبوو: ئومێدەوارم ئەم قسانەم بەمانای ڕەخنەو پەڵپ گرتن یاخوود یاخی

بوون لێك نەدەیتەوە، چونكە بەهەموو دڵسۆزیەكمەوە ئەوە دەڵێم و تاكە ئامانج و مەبەستیشم ئەوەیە كە حەقیقەت بناسم. هەروەها دەمەوێ بڵێم:

تكا دەكەم وای لێك نەدەیتەوە كە ئەم پرسیارانە تایبەتن بە كچە لاوێكەوە كە فەلسەفەی خوێندووە، چونكە تێبینی ئەوەم كردووە كە ئەم پرسیار و كێشەو گرفتانە سەر و دڵی زۆرێك لەو لاوانەیشی گرتووە كە من قسەم لەگەڵ كردوون، بەڵام ئەوان زۆر لێی ورد نابنەوەو رانامێنن، بۆیە دواتر هیچ بایەخ و تاسەیەكیان نامێنێ...

شتێكی تریش هەیە دەمەوێ دانی پیا نێم: بەشێك لەو پرسیارانەی كە ئاراستەی تۆم كردوون، پێشتر لەلایەن هەندێ لە دۆست و هاورێكانمەوە ئاراستەم كراون، پاشتر هەستم بەوە كرد كە لەو پرسیارانەیاندا مەبەستێكیان هەیە، بەهەر حاڵ من دەمەوێ وەڵامی پرسیارەكانم بزانم... لە كۆتایی نامەكەیشدا باسی كردووە كە لە قوتابخانەیەكی نموونەییدا وانە دەڵێتەوەو دەڵێ: (نامەكەی ئێوەم بۆ هاوەڵە مامۆستاكانیشم خوێندەوە...نازانم باشم كردووە یان نا؟)

كە نامەكەی ئەوم پێگەیشت من خۆم ئامادە كردبوو تا نامەی دووەمی بۆ بنووسم. چونكە بڕیارم دابوو كە بابەتی (حەقیقەت)ی لەگەڵدا بخەمە بەر باس و خواس، بەڵام وا ڕووبەڕوی پرسیارێكی نوێ دەبمەوە...نەختێك دوودڵ بووم... ئەرێ بەو جۆرەی كە پێشتر

بڕیارم دا بوو و پلانم بۆ دانابوو نامەکە بنووسم؟ یاخود بایەخ بەم پرسیارە تازەیەی لەیلا بدەم و پێشی بخەم؟ دوایی بڕیارم دا کە وەڵامی ئەم پرسیارەی دوا بخەم کە پەیوەندی بە دادگەری خوداییەوە هەیە..

**نامەی دووەمم بەم جۆرە بۆ نووسیی:**

– ئەی (لەیلا) ی عەودالّی حەقیقەت:

پێش هەموو شتێك دەمەوێ بڵێم: بەهۆی پرسیارەکانتەوە هیچ گومانو خەتورەیەکی خراپم بەرامبەر بەتۆ بەبیردا نەهاتووە. چونکە من هەرگیز دڵگران نابم بەوەی کە تۆ ئەو پرسیارانە دەکەی، بەڵکو دڵگرانی ئەوەم کە ئەو پرسیارانەت لەدڵی خۆتدا پەنگ داون. قەیدی نییە کە نامەکەی منت بۆ هاوەڵەکانیشت خوێندۆتەوە.

وەك پێشتر بەڵێنم پێ دابووی کە ئەم نامەیە سەبارەت بە حەقیقەت دەبێ. خۆ ئەگەر پێویستی کرد ئەوا نامەی داهاتوویش هەر لەسەر هەمان تەوەر دەڕۆین.

دەمەوێ پێش هەموو شتێك بڵێم: هەر کەسێ کە عەودالّی حەقیقەت بێت و بەدوایدا بگەڕێ لە ڕاستیدا بەدوای وەڵامی ئەم پرسیارانەدا دەگەڕێ:

ئایا ئەم بوونەوەرە بێ خاوەنە؟ ئەگەر وانییە ئەی کێ خاوەنیەتی؟ چۆن چۆنی ئیمانی پێ بهێنین تاکو ئەو ئیمانەمان (ڕاستەقینە) بێت؟ ئایا مرۆڤ بونیادێکی بەرەڵڵاو بێ کارەیە، هیچ

ئەرك یان كار یـان بەرپرسـیارێتیەكی لـە ئەسـتۆدا نییـە؟ یـان ئـاخۆ بوونەوەرێكی وەهایە كە ڕابـردووی نـەبوو "عـەدەم" و داهاتوویشـی هەر نەبوو "عەدەم" بێت؟ ئەگـەر وا نـەبێ ئـەی كەواتـە حەقیقـەتی مـرۆڤ چـییە؟ چـۆن لێـی بگـەین و چـۆنیش بیخـەملێنین بـۆ ئـەوەی بەڕاستی ببینـە مرۆڤێكـی ڕاسـتەقینە؟ واتـە ئـەركی ئێمـە چییە تـا لەسـەری بـدوێین یـاخود بـیری لێ بكەینـەوە؟ ئـەی كامانـەن پێوەرەكـانی گـوزەران و هاوسـەرگیریمان تـاكو بـە گـوێرەی ئـەو پێوەرانە مافی ڕاست و شایستەی مرۆڤایەتی بدەین؟

چـەمكەكانی سـێكس و ئـارەزوو چـین؟ ڕاسـتیەكانی نێرینـەیی و مێینەیی چین؟ دەبێ تا چ پلەیەك بایەخ بە سێكس و ئارەزوو بدەین تاكو تەواو واقیعی و ڕاستەقینە بین؟

ئەی حەقیقەتی خۆشەویستی و ترس چییە؟ چـۆن خۆشەویسـتی بكەین؟ كێمان خـۆش بوێـت؟ چـۆن بترسـین و لـەكێ بترسـین؟ ئـەم هەست و نەستانە چۆن چۆنی بـۆ مەبەسـت و ئامـانجی ڕاسـتەقینەی خۆیان بەكاربهێنرێن؟

ئـەی كاكڵـەو حەقیقـەتی داخورپـان و ئومێـد و سـۆز و میهـر و دلۆڤانی و هەست و نەستەكانی تر چییە؟ دەبێ چ كارێ بكەین تاكو ئـەم هەسـتانە لـە ئامـانج و مەبەسـتە ڕاسـتەكەی خۆیانـدا بـەكار بهێنرێن؟

لەیلا! ئەگـەر تـۆ بـەدوای حەقیقەتـدا بگـەڕێیت ئـەوا بـەم جـۆرە وەڵامی ئەم پرسیارانە و وەڵامی پرسیاری تریش دەسـت دەكـەون و

هەموو دڵ و ژیری و هەست و نەستەکانیشت و بگرە هەموو ڕەفتارەکانیشت لەسەر ڕۆشنایی ئەو حەقیقەتە ڕێك دەخەیت.

دەبێ چاك بزانی کە هەر گەڕان و توێژینەوەیەك سەبارەت بە حەقیقەت ئەگەر لە ژیانی کرداریدا ڕەنگ نەداتەوە ئەوا تەنها خۆ خەڵەتاندنە. کاری ئەو جۆرە کەسانە هەروەك کاری ئەوانە دەبێ کە خۆیان خەریك دەکەن بە هەڵهێنانی مەتەڵ و دڵی خۆیانی پێ خۆش دەکەن.

ئەگەر بینیت لەسەر ئەو پرسیارانەی پێشووت ژمارەیەك وەڵام هەبوون، ئەوا بزانە کە تەنیا وەڵامێك لەو وەڵامانە ڕاستە و ئەوانی تر هەڵەن.

کەواتە چۆن ڕێگە بگرینە بەر بۆ گەیشتن بەو حەقیقەتە کە ناگۆڕێ و ناژمێردرێ.

پێش وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە دەمەوێ بچمە سەر ئەو هۆکارانەی کە دەبنە کۆسپی سەر ڕێگای گەیشتن بە حەقیقەت:

**هۆکاری یەکەم:** بریتییە لە قەناعەتی تاکەکەسیو هەواو هەوەسی دەروون و کەمتەرخەمی خۆیی و ژیانی تایبەتی هەر کەسێك... ئەگەر چی جەستە خزمەتکارە و ڕۆح لەمەقامی حاکم دایە، کەچی ئەوانەی ڕۆحی خۆیان کردوەتە خزمەتکاری جەستەیان و پێیان وایە کە تاکە مەبەستی هاتنی مرۆڤ بۆ دنیا هەر ئەوەیە

ئارەزوو و هەوەسە جەستەییەکانی خۆی مسۆگەرو تێر بکات...بۆ ئەو جۆرە کەسانە زۆر سەختە کە بگەنە حەقیقەت.

**هۆکاری دووەم:** بریتی یە لە ژیانی خێزانی...پێکهێنانی خێزانو بەردەوام بوونی وەچەو نەوە، ئەمەش یەکێکە لە یاساکانی ژیانو یەکێکە لە دیوەکانی تاقی کردنەوە لەم ژیانەی دنیادا. جا هەرکەس لەم حەقیقەتە بێ ئاگابێتو هاوسەرگیری بکاتە گرنگترین ئامانجو مەبەستی خۆیو، هەموو ڕەنج و هێزێکی بازووی خۆی ماندوو بکات بۆ دەستەبەرکردنی گوزەران بۆ ئەندامانی خێزانەکەی یاخود کرینی پێداویستی و جوانیەکانی ماڵ..ئەو جۆرە کەسانە لە ڕێبازی گەیشتن بە حەقیقەتدا دووچاری سەختی و دژوارییەکی زۆر دەبن.

**هۆکاری سێیەم:** بریتی یە لە ژیانی کۆمەڵایەتی. لەنامەی پێشوودا لەسەر ئەم بابەتە شتێکم نووسیبوو... دەمەوێ لێرەدا شتێکی بۆ زیاد بکەمو بڵێم:

دەبێ چاك بزانین کە لەم ژیانەی دنیادا هەرچی سامانو پلەوپایەو دیاردەکانی دەسەڵات و مەقام هەیە هەموویان لەلایەکەوە خەڵات و دیاری و چاکەن، لەلایەکی تریشەوە تاقی کردنەوەو ئەزمونن... تادوێنێ بوو کەسانێك هەبوون ئەو ڕۆڵانەیان بینی و تاقی کرانەوە، ئایا ئەرکەکانی خۆیان ئەنجام داوە یان نا؟ وا ئێستا ئێمەش هاتوینەتە سەر شانۆی ژیانو نۆرەی ئێمەیە. جا ئەگەر مرۆڤ ئەم پرس و باسە بەو جۆرە هەڵنەسەنگێنێ، بۆ نموونە ئەگەر دەوڵەمەندیی بە مەبەستی ڕاستەقینەی ژیان و دانستی بوون و

بەدیهاتنی دنیا دابنێ، ئەوا زۆر سەخت و دژوارە کە بگات بە حەقیقەت.

ئەم بابەتە لایەنێکی گرنگی هەیە و دەمەوێ ڕوونی بکەمەوە:

گەیشتن بە حەقیقەت شتێکە و ژیان بەگوێرەی حەقیقەت شتێکی ترە، لەناو کۆمەڵگەی ئێمەدا گرۆیەك هەن بنەماو بیرو هزریان لەسەر بناغەی ڕاستی و حەقیقەت دامەزراوە، کەچی ئەو حەقیقەتە لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتیاندا ڕەنگی نەداتەوە، کاتێ کەسانی داماویش سەیری ئەوانە دەکەن دەڵێن:

– تۆ بڵێی ئەمجۆرە کەسانە هیچ حەقیقەتیان پێ بێ؟

یان

– تۆ بڵێی ڕێ و ڕێبازی ئەم کەسانە ڕێگەیەکی ڕاست و دروست بێ؟!

لەڕاستیدا ئەم قسەو قسەلۆکانە خاڵین لە حەقیقەت...چونکە حەقیقەت چ لەدەستی ئەم یان ئەودا بێت هەر حەقیقەتە. بەڵام کەم و کوڕی و کەمتەرخەمی ئەم کەس یان ئەو کەس پرس و باسێکی ترە و بەجیا هەڵدەسەنگێنرێ، چونکە هەرگیز ڕەوا نییە تێکەڵ بکرێن.

لەم کۆمەڵگایانەی کە ئێمەی تێدا دەژین، زۆربەی خەڵك ماددەو قازانج و سیاسەت پێش هەموو شتێکی تر دەخەن... ڕەوشتی بەرز و ئاکاری جوانیش لە دواوە دادەنێن... ئەم ڕەوشە ژەهراویە زۆر

بەخراپ دەشکێتەوەو کاریگەریی خراپ لەسەر زۆربەی خەڵك دادەنێت...بێگومان عەقڵ نایبڕێ کە سەیری نەخۆشەکان بکەین و بیانکەین بە بیانووی دوژایەتی کردنی چارەسەرو چاکبوونەوە.

جا ئەوانەی کە لەم گۆشەیەوە تەماشای ئەو پرسە ناکەن، کاتە زێڕینەکەیان بە قسەو قسەلۆکو پاگەندەو قاوی بێ سەروبەرەوە لەکیس دەدەن. ئەوانە حاڵیان وەك حاڵی بازرگانێکی شێتە کە دەسبەرداری بازرگانیەکەی خۆی دەبێ‌و خۆی دەسخەڕە دەکات و دەڕوات مشووری زیانەکانی کەسانی تر دەخوات. بێگومان ئەوانە پاشەڕۆژیان دۆڕانی ئاشکرایە.

هەر کەسێکیش بتوانێ ئەم سێ کۆسپە: ( کۆسپی خودی خۆی، کۆسپی خێزان، کۆسپی کۆمەڵگا ) تێپەڕێنێ، ئەوا دەتوانێ فراوانترین بازنەی دەوری خۆیشی کە گەردوونە زۆر بەڕاستی و دروستی بخەملێنێت و لەناو دەریای سروشتدا نوقم نەبێت.

ئەم جیهانەی کە لەبەر چاومانە پێی دەڵێن: پەڕاوی بوونەوەر، پەڕاوێکە کە هەموو لاپەڕەو هەموو دێڕێکی پڕاو پڕیەتی لە واتا... مرۆڤ بۆ خۆی تەنیا وشەیەکە لەو پەڕاوەدا... بەڵام وشەیەکی ژیر و هەستدار و بیریارە... وشەیەکە چەندەها سیفەتی زۆری وەك زانست و ویست و گوێ و چاوی پێ خەڵات کراوە کە پێیانەوە بتوانێت خۆی و وشەکانی تریش بخوێنێتەوە هەرکەسە و بەگوێرەی توانا و لێوەشاوەیی سنورداری خۆی... مرۆڤ وشەیەکی زەحمەتکێشو

ڕەنجدەرە و دەتوانێ لە پەڕاوی بوونەوەر ڕابمێنێو هەوڵی دۆزینەوەی نهێنیەکانی بدات.

جا ئەگەر ئەو وشەیە پێی خۆشە حەقیقەتی دەست بکەوێ، ئەوا دەبێ سەرەتا لەوە تێ بگات کە خۆی ( وشە)یەکەو ( نووسراو )ە، تاکو بتوانێ لەسەر ئەم بنەماو تێگەیشتنە هەموو نووسراوەکانی تریش هەڵسەنگێنێت بێ ئەوەی لە نێو جەنجاڵی دێرە نووسراوەکانی تری پەڕاوەکەدا ون ببێت و سەری لێ بشێوێت. دەبێ چاك بزانێ کە سەرچاوەی زانستەکەی دیاری و خەڵاتی تەرەفی زانایەکە، دانایی و ژیریەکەی لە لایەن دانایەکەوە و تواناکەشی لە لایەن خاوەن توانایەکی ڕەهاوە پێشکەش کراوە، هەر کەسێکیش نەگاتە ئەم تێگەیشتنە ئەوا لە ژێر مەینەت و گرفت و ناسۆرەکانی ژیاندا دەهاڕێت و دەبێتە نێچیری چنگی شپرزەیی و دڵەڕاوکێ.

لەیلا! بەمجۆرە تۆ بانگهێشت کراوی تاکو ئەم پەردە و ئاستەنگانە تێپەڕێنیت، من دڵنیام ئەگەر ویستی خۆت بەکاربهێنی سەرکەوتوو دەبی، چاوێك بگێرە بەدەوری خۆتدا، ئەوەتا ڕاستیەکان چواردەوریان داوین، وانییە؟ بەڵام بینینی ئەم ڕاستیانە پێویستی بە کەمێك ماندووبوون هەیە..

باش بیر بکەرەوە!.. بوون (وجود)ی بوونەوەران بەدەورماندا ڕاستی و حەقیقەتە، بۆیە نابینین کەسێ گومانی لەوە هەبێ یان

موناقەشەی لەسەر بکات. چونکە کەس موناقەشەی بوونی خۆر یان مانگ یان زەمین یان مرۆڤ ناکات.

کەواتە بوونی شتەکان ڕاستی یەو حاشا هەڵناگرێ. ڕاستیەکی تریش هەیە کە هەروەك ئەم بەهێز و بەڵگە نەویستەو هیچی لەو کەمتر نییە کە بریتیە لەوەی: هیچ لەو بوونەوەرانە خۆیان خۆیان دروست نەکردووە و نەهێناوەتە بوونەوە.

خۆ مزگەوتی جوان و ڕازاوەی (سلێمانیە)[1]ت لەپێش چاوە و دەیبینی... کەس نییە نوکوڵی بوونی بکات... کەسیش ناوێرێ و ناتوانێ پاگەندەی ئەوە بکات کە ئەو مزگەوتە بەبێ تەلارساز دروست کراوە.. خۆ ئەگەر منداڵێکی سێ ساڵان ببینێ یەکسەر لە باوکی دەپرسێ: بابەگیان کێ ئەم مزگەوتەی دروست کردووە؟

خۆ ئەگەر ئەو دوو ڕاستیە بخەینە تەنیشت یەکتر ئەوا دەزانین و تێدەگەین کە بەرودوای بوونەوەران لەلایەن یەك بەدیهێنەر و ئەفرێنەوە بەدیهاتوون. هەموو بوونەوەرێك شێوەیەکی دیاری کراوی هەیە.. ئەمەش دیسان حەقیقەتێکی ترە. ئەو شێوەو دیمەنەش گونجاوترین سیمایە بۆ ئەو بوونەوەرانە... پڕ بە پێستی خۆیەتی، نەزیادەو نەکەم... دەست نەدراوە بە باڵدار، باڵیش نەدراوە بەمەڕ، پێ نەدراوە بە مار و چرنوکیش نەدراوە بەماسی.

---

١- مزگەوتی سولەیمانیە شاکارێکی تەلارسازی زەمانی خەلافەتی عوسمانییە و لە شاری ئەستەمبوڵ لەلایەن بیناسازی بەناوبانگ "سینان "ەوە بینا کراوە.

ئـا ئێستا سـەدان هـەزار ئاوەڵەمـەی مـرۆڤ هـەن و لـەناو ڕەحمـی دایکیانـدا شـکڵ و وێنـەی خۆیـان وەردەگـرن... ئـادەی ئاوەڵەمـەی گیانـدارانیش بخـەرە سـەر ئـەو ژمارەیـە. هـەر بـەوە واز مەهێنـەو هەرچی هێلکە هەیە وەك (ڕەحـم) هـەژماریان بکـەو ژمـارەی هـەموو جوجکـەو زەرنەقوتـەکان کـە لـەناو ئـەو هێلکانـەدا هەڵـدێن، بهێنـە بەرچـاوی خـۆت.. هــەر هــەموو ئـەو ئاوەڵەمانــە وەك تابلۆیــەکن لەبەردەم نەخشەساز و وێنەکێشێکدا دانراون و هیچ لەبارەی خۆیـان و سیماو دیمەنی خۆیانەوە نازانن... هەموو ئەو مادە و کەرەسـانەی کە لە بونیادی ئەو ئاوەڵەمەو لەکاتی وێنە سـازیەکەیدا بـەکارهاتوون هـیچ هەسـت و نەسـتێکیان نییـە وەك چۆن مەرەکـەبی قەڵـەم هـیچ هەستێکی نییە... هەموو دایکان هیچ شتێ نازانن لەبارەی ئەوەی لە ڕەحمیاندایە هەروەك چۆن توێکڵی هێلکەیش هیچ لـەبارەی نـاواخنی خۆیەوە نازانێ..

هـەمان شـت سـەبارەت بـە دایـە زەمینـیش بڵـێ، بەچـاوی بـیر و ئەندێشەوە بڕوانە ئەو تۆوانەی کە لە ژماردن و ئامـار نایـەن و لـەناو ڕەحمی زەمیندا چەکەرە دەکەن و دەڕۆن.

ئەگەر توانیت لە کرداری بەخشینی وێنەکەوە بگوازیتەوە، واتە لە کـرداری وێنەگرتنەکـەوە بـۆ " وێنەگرەکـە"، ئـەو کاتـە دەگەیتـە حەقیقەتەکـە، بـەڵام ئەگــەر هــەر بــە سەرســوڕمانەوە خــەریکی سـەیرکردنی ڕەنگـەکانی سـەر تـابلۆی وێنەکـە بوویـت و نکۆڵیـت لـە

وێنەکێشەکە کردو فەرامۆشت کرد، ئەوکاتە دادەبەزیتە ئاستی منداڵێکی ساوا کە عەقڵی بەهیچ شتێك ناشکێ.

با لەسەر هەمان تەرزی ڕامان و بیرکردنەوە بەردەوام بین...خۆ دیاردەی (بینین) ڕاستیەکەو گومان هەڵناگرێ، بەڵام ڕاستیەکی تریش هەیە هەروەك ئەو بەڵگەنەویستە کە بریتییە لەوەی: هیچ زیندەوەرێکی بینەر نییە کە بەحەز و ئارەزووی خۆی بوویێتە خاوەنی سیفەتی بینین... ئەو کەسەی کە سەر لە پزیشکی چاو دەدات بۆ پشکنینی چاوی، زۆر جیاواز نییە لەو کەسەی کە بۆ نموونە دەڕوات بۆ لای وەستای ئامێری نووسین... ئەوەتا هەردووکیان ئارەزووی چاکردنەوەی ئامێرێك دەکەن کە دروستکراوی دەستی خۆیان نییە..

کاتێکیش بەم شێوەیە لە (بینین) تێدەگەیت، ئیتر دەرك بەوە دەکەیت کە زاتێك هەیە کە بەهرەی چاو و بینینی خەڵاتی زیندەوەران کردووە.

خۆ دەتوانین هەمان هەڵسەنگاندن سەبارەت بە سیفەتەکانی تری وەك بەخشینی سیفەتی ژیان و قسەکردن و بیستن و رزق و ڕۆزی و... تاد بکەین.

ئایەتی ﴿ كُلُّ نَفسٍ ذائِقَةُ المَوتِ ﴾ (الأنبياء: ٣٥) ئاماژە بە حەقیقەتێکی تر دەکات...ئەو حەقیقەتەش تۆسقاڵێك بوونی ئیمان و نەبوونی ئیمان بەو پرسە ناگۆڕێ.

له ئایەتێکی تریشدا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَاهُ سَمِيعاً بَصِيراً﴾ الإنسان: ٢، جا هەروەك بەدیهێنانی مرۆڤ لە دڵۆپە ئاوێك ڕاستیەکی نەگۆڕە، هەر بەو جۆرەش تاقی کردنەوەی مرۆڤ لەم دنیایەدا حەقیقەتێکی ترە.

ئێمە هەموومان بەدرێژایی ژیانمان لە ئەزموون و تاقیکردنەوەداین... جا ئایا دەتوانین هەرچی سەرمایەیەك کە هەمانە وەك بیستن و بینین و تواناکانی تر لە جێگەی ڕاست و دروستی خۆیاندا بەکار بهێنین یان نا؟

بە هاتنی وادەی مردنیشمان یەکسەر پەڕەی تاقیکردنەوەکە لەژێر دەستماندا دەردێنن...کات تەواو بوو بواری نووسینییەك وشە نەماوە.

هەروەك لەو ساتە وەختەدا پێمان بڵێن: "خۆ ئێوە چاوی خۆتان بەکارهێناو ئەوەی بینیتان چ حەڵاڵ بێت یان حەرام بینیتان.. ئێستا ئەوەندە بەسە، چونکە ئیتر ببڕای ببڕ ناتوانن تاقە تروسکاییەکی ڕووناکی ببینن... وزەو توانای بینین کۆتایی هات."

"ئێوە چ بە ڕێگەیەکی ڕاست بێت یان هەڵە عەقڵی خۆتان بەکارهێنا... ئێستاکە ئەوەندە بەسە... چیتر لەمەودوا ناتوانن لەیەك پرس و بابەتیشدا بیر بکەنەوە."

"لەدڵتانـدا بڕواتـان بەچـەندین شـت هـەبوو چ ڕاسـت بـن یـان ناڕاسـت... ئێسـتاکە ئەوەنـدە بەسـە... ئـیتر لەمـەولا نـاتوانن هـیچ هەڵسەنگاندن و پەسەندکردنێك بکەن..."

"..................

"..................

خـۆ ئەگـەر بـاش لەئایەتەکـەی پێشـوو وردبیتـەوە دەبینـی نافـەرمووێ: ﴿كُلُّ نَفسٍ تَموت﴾ واتـە گشـت کەسـێ دەمـرێ. بـەڵکو فەرموویەتی: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذائِقَةُ المَوتِ﴾ کەواتە ئاماژە بۆ بوونی چەندان سفرەو خوان دەکات لەبەر دەمماندا..

(خـۆ ئێـوە لـە سـکی دایکتانـدا نـۆ مـانگ مانـەوەو خۆراکتـان دەخواردو گەشەتان دەکرد، دوای ئەو مانەوەیە تامی لە دایـك بـوون و هاتنە دنیایشتان چەشت، لەم دنیایەشدا تەمەنێکتان بەسەر بـرد و تامی ژیانتان نۆش کرد، ئێستاش وا نۆرەی ئـەوە هـاتووە کـە تـامی مەرگ بچێژن، ژیانی گۆڕیشتان لە پێشە، پاش ئەویش کـاتی حەشـر و، حیساب دێت).

پاشـان، ئـەی ئەوەنییـە ئایەتەکـە باسـی تاقیکردنـەوەی مـرۆڤ دەکات ئاماژە بۆ هەمان حەقیقەت دەکات؟

بە تەواو بـوونی تـاقی کردنـەوە هـەموو شتێك کۆتـایی نایـەت... بەپێچەوانەوە زۆر شت دوای تـاقی کردنـەوە دەسـت پـێ دەکـات... قـازانج و بردنـەوە یـان زیـان و دۆڕانـدن... بەختـەوەری یـان

بەدبەختی... دەوڵەمەندیو گوشادی یان هەژاریو تەنگانە، هەموویان دوای تاقیکردنەوەن.

ئایەتێکی تر هەیە و باس لەوە دەکات کە مرۆڤ هەرچەندە لە دڵۆپە ئاوێك خولقێنراوە کەچی لە ئاست ئەو بەخششەدا سپڵە و بەدنمەکە: ﴿خَلَقَ الإنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ﴾ النحل:٤، هەر دەڵێی ئەو ئایەتە دڵی مرۆڤ دەدوێنێت و پێی دەڵێت:

لەنێوان ملیۆنان تۆودا تۆ هەڵبژێردراوی، کە بێگومان لوتف و چاکەیەکی ئێجگار مەزنە... وا بوویتە پاڵێوراو تاببیتە مرۆڤ، تۆوە هاوڕێکانی ترت فڕێ درانە دەرەوەی ڕەحم بە دەردی ئەو تۆوانەی کە گڵیان دەست ناکەوێ بۆ شین بوون.. ئەوان ڕۆشتن و تۆ مایتەوە.. ئەوکاتە نە لێو، نە زمان نە مێشك هیچیانت نەبوو... هەر ئەو زاتە شاباشی کردی بە خەڵاتی قسەکردن.. هەر ئەویش هێز و ئیرادە و بیرکردنەوەی پێ بەخشیت... ئاخۆ ئێستا خەڵاتەکانی ئەو بەکاردەهێنی لەنافەرمانی ئەودا؟! )

لەوانەیە ئەم پرسیارەشت بەخەیاڵدا بێت:

بۆچی ئەم دەرفەتە بە مرۆڤ درا؟ بۆچی لەو کاتەدا کە مرۆڤ نافەرمانی خوا دەکات، خوایش سوك و ڕسوای ناکاتو لەناوی نابات؟

وەڵامەکەی لە ئایەتەکەی پێشوودا هەیە: ﴿ إِنَّا خَلَقْنَا الْإِنسَانَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ...﴾ الإنسان: ٢، چونکە لە ماوەی ئەنجامدانی

تاقیکردنەوەکەدا کەس دەست وەرناداتە ڕەوشی تاقیکردنەوەکەوە، جا ئەگەر وەڵامەکانی ئەو کەسەی تاقی دەکرێتەوە هەموویان هەڵە بوون، ئەوا هەرکات بە هەڵەکەی خۆی دەزانێت دەتوانێ بەتەوبە و پەشیمان بوونەوە هەموو وەڵامە هەڵەکانی پێشووی بسڕێتەوە، کەواتە لێرەدا هیچ مەترسیەك نییە لەسەر ئەوەی کە کاتی پێویست بە دەستەوە نەبێت بۆ وەڵامدانەوەی راستو دروست).

هیوای بەهرەیەکی فراوانی پەی بردن بە حەقیقەتت بۆ دەخوازم، بەم ئومێدە نامەکەشم کۆتایی پێ دێنم...و السلام.

مانگێك تێپەڕی بەسەر دوا نامەدا کە بۆ( لەیلا )م ناردبوو. کاتێ سەردانی کتێبخانەی برادەرەکەمم کرد زانیم کە نامەیەکم لەلایەن ( لەیلا ) وە بۆ هاتووە.

لەو نامەیەدا لەیلایەکی تری تەواو جیاواز بوو لەوەی پێشوو...هەستی دوو دڵیو نائارامی جێگەی خۆیان چۆڵ کردبوو بۆ ورەو حەماسەت، لە دێڕەکانی نامەکەیەوە ڕۆحێکی دلێر و شێرانەم بەدی کرد کە هیچ نەیگرێتە خۆ...ڕۆحێك کە بەگەشبینیەوە بەدوای حەقیقەتدا دەگەڕا.

لەنامەکەیەوە دەردەکەوت کە لەیلا لەو ماوەیەی پێشوودا ژمارەیەکی زۆر کتێبی خوێندۆتەوە...ڕستەکانی زیاتر بەبڕشت و مانادار بوون، لەکۆتایی نامەکەیدا دەیوت:

زۆربەی گفتوگۆ و قسەکانم لەگەڵ کچە لاوەکاندایە، بەتایبەت ژنە مامۆستاکان. من ڕێم لە فەلسەفەی جۆراوجۆر دەکەوێ دەربارەی ژیان، دەگەم بە تێگەیشتنێکی ژنانەیش بۆ بابەتەکان... ئەگەر چی هەوڵیش دەدەم هەندێ شتیان تێ بگەیەنم، کەچی زۆرجار واهەست دەکەم کە زانیاریەکانم کەم و کوڕن و بەس نین.

تا ڕادەیەك ئەوەی لە نامەکانی تۆوە تێگەیشتبم لەناو ئەو هەموو ڕاو بۆچوونانەدا تەنیا ڕایەکی فەلسەفی ڕاست و دروست هەیە، ئەویش بڕیاری پەروەردگارمانە کە ئێمەی بە (مێ) دروست کردوەو ژیانی خەڵات کردووین.

من لە ناخی ڕۆح و لاشەمەوە بڕوام بەوە هەیە، بەڵام ناتوانم قەناعەت بە کچانی تر بکەم. هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئێمەی گرۆی ژنان وا دەردەکەوێ لە پیاوان کەمتر ئارام دەگرین بۆ گوێگرتن لە ئامۆژگاریەکانی کەسانی تر. هەرچۆن بێ و هۆکار هەرچی بێت ئەوا ئەنجامەکەی هەر خۆیەتی و ناگۆڕێ.

تکات لێ دەکەم لەم بارەیەوە نامەیەکم بۆ بنێری.

پاش چەند گوزارشێکی ڕێزو سڵاو کۆتایی بەنامەکە هێنابوو...

هیچ پەلەم نەکرد لە نووسینی نامەدا بۆ لەیلا، خۆ بینیم کە چەندە عەودالۆ جیددی و شێلگیرە لەسەر ڕێبازی گەڕان بەدوای حەقیقەتدا، بۆیە وام بەباش زانی کە لێی گەڕێم زیاتر بخوێنێتەوە و زیاتر لەناو کتێبو سەرچاوەکاندا قووڵ ببێتەوە.

پاش تێپەڕینی زیاتر لەمانگێك ئەم نامەیەی خوارەوەم بۆ نووسی:

بۆ لەیلای عەودالّی حەقیقەت:

یەکەمین جار کە نامەکەت لە کتێبخانەکەدا بەجێ هێشت پرسیارێکی سەبارەت بە ئافرەتان تێدا بوو کەباسی لە یەکسانی ژن و پیاو دەکرد. کەچی لەم نامەیەی ئەمجارەتدا دەبینم ئەو بابەتەت نەوروژاندووە، ئەوە سەرنجی ڕاکێشام، کەواتە ململانێ وروژاوەکەی پرسیاری: ( ئایا ژن یەکسانە بە پیاو یان نا؟) فرێت داوەتە دەرەوەی بایەخی خۆتەوە...لە پرسیارێکی تریشدا جێگەی ئەوی گرتووەتەوەو وتوتە: من چی بە ژنان بگەیەنم و پێیان ڕابگەیەنم؟ چۆن بتوانم سوودیان پێ بگەیەنم؟ ) واتە تۆ حەزت لە شتێکی بە سوود و بەکەڵکە. بۆیە منیش پیرۆزبایت لێ دەکەم.

نامەوێ وا تێبگەی کە من وەڵامی بابەتی یەکسانیەکە فەرامۆش دەکەم، بەڵکو تەنیا نەختێ دوای دەخەم.

لەیلا! بڕوانە، لەم گەردوون و بوونەوەرەدا هەموو ئان و ساتێك بێ وەستان چەندین جموجوڵ و کارو چالاکی بێشومار ئەنجام دەدرێن، خۆر لە چەندین چین و توێژ پێکهاتووە، هەموو چینێکیش جووڵەو خێراییەکی جیاوازی هەیە، ئەو ئەستێرانەی بەدەوری خۆردا دەخولێنەوە، هەموو کۆمەڵەی خۆر، بەجارێك جوڵەیەکی تریان هەیە و ڕوو لە ئاراستەو ئامانجێکی دیاریکراو دەکات. خۆ مەجەرڕەی

( ڕێگای کاکێشان) کە کۆمەڵەی خۆریش بەشێکە لەو، ئەویش دیسان لەجوڵەو چالاکیەکی تری جیاواز دایە. هەرچی لەم گەردوونەدا هەیەو ڕوو دەدات پەیوەندی بە ئێمەوە هەیە.

بیر لە گۆی زەمینی خۆمان بکەرەوە کە بەدەوری خۆی و بەدەوری خۆردا دەخولێتەوە، هەر جۆرێك لە جوڵەکانی خێراییەکی جیاوازیان هەیە، ئەم مرۆڤە کلۆڵەیش کە ئەگەر بەخێراییەکی کتوپڕ ئۆتۆمبیلێك بەلای ڕاست و چەپدا بیخولێنێتەوە یەکسەر سەری گێژ دەبێت و دەڕشێتەوە...ئەم مرۆڤە کە بەئارامی و ئاسوودەیی و نەترسیو بێخەمیەوە لەسەر ئەم زەویە دەژی کە بەخێراییەکی زۆرو دوو جوڵەی جیاواز دەخولێتەوە بێ ئەوەی هیچ هەراسان ببێت.

بۆچی؟

بێگومان بۆ ئەوە نییە کە ڕابوێرێ و هەر بە مەستی و غافڵی بمێنێتەوە و نکوڵی ئەو بەخششانە بکات کە خەڵاتی کراون.. ئەم کاروچالاکیانەی بوونەوەر لەخودی جەستەی مرۆڤیش دا دەردەکەون: ئەوەتا دڵ هەمیشە کار دەکات، خوێن بەبێ وەستان و پسان بەلەشدا دەسوڕێتەوە.. بەردەوام خانەکانی لەش دەگۆڕێن.. هەموو ئەم کاروچالاکیانە بەردەوام ڕوو دەدەن بێ ئەوەی مرۆڤ تووشی هیچ هەراسانی یان ئازارێك ببێت.

بۆچی؟

بێگومان بۆ ئەوە نییە کە مرۆڤ بێ ئاگا لەڕووداوەکان بژی.

ئەم کردارو چالاکیانە کە لە بوونەوەرو جەستەدا بەبێ پسان ئەنجام دەدرێن و لەناو ڕۆحدا لە شێوەی ڕامان و بیرکردنەوەی هەمیشەییدا ڕەنگ دەداتەوە. مرۆڤ بەردەوام لە بیرکردنەوەدایە... تەنانەت لەخەویشدا بیری کار دەکات و ناوەستێ، کەواتە مەسەلەکە لە لایەن و ڕوویەك لە ڕووەکانی بیرکردنەوەدا کۆ دەبێتەوە.

خۆر بەردەوام وزە بەرهەم دەهێنێت بۆ ئەوەی مرۆڤ بیر بکاتەوە. دنیاش بەردەوام دەسووڕێتەوە بۆ ئەوەی مرۆڤ بیر بکاتەوە.

بەچی بیر بکاتەوە؟

بێگومان بەگەدە یان بەهەوەس بیر ناکاتەوە.

بڕوانە ئەم فەرمایشتە شیرینەی حەزرەت ﷺ چەندە پەند و ئامۆژگاری جوانی لەخۆ گرتووە کە دەفەرموێ: ( النّاسُ نيامٌ فَإذا ماتُوا إنتَبَهوا). واتە: (خەڵك خەوتوون، هەرکاتێ مردن ئەوسا بێدار دەبنەوە..) بەڵام لەیلا خان! گرنگ ئەوەیە ئێمە پێش مردن بێدار ببینەوە.

ئەم فەرموودەی پێغەمبەریش ﷺ (مُوتُوا قَبْلَ أنْ تَموتُوا) واتە: بمرن بەر لەوەی بمرن، ئاماژە بۆ هەمان ماناو مەبەست دەکات.

لێرەدا پێم خۆشە یادەوەریەکی خۆمت بۆ بگێڕمەوە ئەگەر چی چەند ساڵێکی بەسەردا تێپەڕیوە، بەڵام نەمتوانیوە لەبیرم بچێتەوە:

گۆڕستانێك هەبوو.. بەرپرسان بڕیاریاندا بەمەبەستی فراوان کردنی شار لەو شوێنە لایبەن‌و بیگوێزنەوە، ئەگەر چی ئەو شارە خامۆشە هێمای پەند وەرگرتن و بێداربوونەوە بوو، ئاگاداریەکیان بڵاوکردەوە و نووسرا بوو: ئەم گۆڕستانە لەم جێگەدا لەبەرواری ئەوەندەدا لادەبرێت، کێ ئارەزووی گواستنەوەی مردووەکانی دەکات بۆ گۆڕستانێکی تر، با پێش ئەو بەروارە ئەنجامی بدات..)

هیچ کەس گوێی بەو ئاگاداریە نەدا، چونکە مردووەکان چەند ساڵێك بوو لە گۆڕستانە تازەکەدا ئەسپەردە دەکران، مردووەکانی ئەم گۆڕستانە پێش چەندین ساڵ لەوێ نێژرابوون بۆیە کەسیان خزمێکی وای نەبوو..

ڕۆژی دیاریکراو هات. بلدۆزەرەکان هاتن و ئەو شارە خامۆشەیان سەرەونخون کردەوە...هیچ لاشەیەك دیار نەبوو، بەڵکو تەنیا ئێسك‌و پرووسك بوون، هەندێکیان پوابوون و هەندێکیان مابوون... بلدۆزەرەکان ئەو هەموو ئێسك‌و پرووسکەیان کۆکردنەوە و تێکەڵیان کردن بەسەر یەکداو کردنیانە گەلابەوە بۆ گواستنەوەیان...

گەلابەکان بەدوای یەکدا ڕیزبوویوون‌و بارەکەیان ئێسك و پروسکی مردووان بوو... تەنانەت تا ئێستاش ئەو دیمەنە سەیرو سامناکە کاریگەری لەسەرم هەیە...ئێسك و پروسکی مردووەکان کە لەناو ئەو گەلابانەدا بوون تا دوێنێ دانیشتووان و خەڵکی ئەم شارە بوون، لەناویاندا دەوڵەمەند و، هەژار هەبوو، ئەوانەی تا دوێنێ

لەسەر سەروەت و سامان و پلەوپایە دوژمنایەتیو کێبڕکێو ململانێیان دەکرد.. هەموو ئەوانە لەناو گەلابەکاندا دەستیان لەملی یەکتر کردوەو تێکەڵ و پێکەڵ بوون و پێکەوە شارەکە بەجێ دەهێڵن...

خۆ شەیداو ئەویندارەکانیش هەر بە هەمانجۆرن... واجەستەیان بووە بەخۆڵ و تێکەڵ و پێکەڵ بوون بەسەریەکدا...وا ئەم شارە بەجێ دەهێڵن کە پڕپڕیەتی لە کوڕوکچانی مەست و بێئاگا.

فەرمایشتێك هەیە کە من ماناکەی دێنم کە دەفەرموێ: ( بیر لە مردن بکەنەوە کە هەموو شیرینی و خۆشیەکان تاڵ دەکات)[١].. ئەم فەرمایشتە دەبێ چەندە فاکتەری بێداری و وریابوونەوە بێت؟!

مرۆڤ هەرچی لە دەستی بێت دەیکات تامردنی لە بیر بچێتەوە، کەچی خۆشی بێو ترشی بێ بە مردوویی دەیبەن بۆ گۆڕستان...وا سەرگەرم بووە و هەر خەریکی ڕابواردن و چێژو خۆشیە ڕازاوەکانی ژیانە، هەر ئەوەندەی زانی کتوپڕ دەگلێت و دەڕوات بۆ ناو تاریکایی گۆڕ...

لەیلا! داوات لێ دەکەم هەمیشە ئەوەت لەیاد بێت کە بیرنەکردنەوە لە شتێکی دیاری کراو و هەوڵدان بۆ لەبیر بردنەوەی کەڵکی نییە و برینێك تیمار ناکات و گرفتێك چارەسەر ناکات، چاو

---

١- دەقی فەرموودەکە لەپەڕاوی ( ریاض الصالحین ل(٤٢) دا بەم جۆرەیە: ( أكثِروا ذِكرَ هادمِ اللّذّاتِ) یعنی: الموت رواه الترمذي وقال حديث حسن ٢٣٠٨ورواه ابن ماجة.

نوقاندنیش نابێتە هۆی شاردنەوەی ڕاستیەکان. ئەگەر قوتابی تاقیکردنەوە لەبیر خۆی بباتەوە لەوانەیە دەرفەتێکی بۆ هەڵکەوێ تا کەمێك ڕابوێرێ، بەلاَم چەندین ئازار و خەفەتی زۆر و گرفتی گەورە بەدوای ئەم بێ ئاگاییو لەبیربردنەوەدا دێن.

ئەو سەرمایەدارەی کە سەرمایەکەی خۆی بە بێ مانا تەخشان و پەخشان دەکات، لەوانەیە تاماوەیەکی کورت نەختێ بەخۆشی و چێژەوە بەسەر ببات، بەلاَم ئاکام و ئەنجامی ئەو ڕابواردنە زۆر سەخت و دژوار دەبێت.

من پێم وایە فەلسەفەی: ( ڕابواردنی هەنووکەیی ) و (ئەو نانە نانە ئێستا لەخوانە) و ( بیرنەکردنەوە لەدواڕۆژ و داهاتوو) فەلسەفەیەکە هیچ شایسەتە نییە بە مرۆڤێك کە ڕێز و شکۆی خۆی ڕاگرێت.

ئەوانەی هەوڵ دەدەن مردنیان لەبیر بچێتەوە من ئەیانچوێنم بەم حاڵەتەی خوارەوە:

گریمان تۆ لەناو باخچەکەتدا دانیشتویت و پشوو دەدەیت، لەوکاتەدا مێروویەك بەتەنیا خۆی دەبینی، تۆش سۆزت بۆی دەجوڵێ و بە نیازی گەمەو یاریکردنەوە پەنجەی لێ نزیك دەخەیتەوە، کەچی مێرووەکە بەگوێرەی بڕوای خۆی خێرا دوور دەکەوێتەوەو هەڵدێت، تۆیش بەخۆشیەوە چاوت بڕیوەتە ئەو ڕاکردنەی... مێرووەکە دەڕوات و –بۆ نموونە– خۆی لە پشت

پاکەتـە شـقارتەیەکەوە دەشـارێتەوە، تـۆش ملـت درێـژ دەکـەیت و لەنزیکەوە چاودێری دەکەی.. پاش کەمێك مێروویەکی تریش دێـت و لـە مێرووەکـە نزیـك دەبێتـەوە کـە واخـەیاڵ دەبـات بـە هاوەڵەکـەی دەڵێت: پێش کەمێك ڕزگارم بوو لە مەترسیەکی مرێنەر، شتێکی زۆر زەبەلاحم بینی لەبەردەممدا و خێرا ڕام کرد و سوپاس بۆ خـوا لـەو مەترسیە ڕزگارم بوو!

هەڵوێسـتی ئێمـەش لـە فریشـتەی مـەرگ زۆر جیـاواز نییـە لـەو هەڵوێستە. لە هەرکوێ بین و ڕوو لە هەرکوێ بکـەین و هـەوڵ بـدەین لەپەنای هەر شتێکدا خۆمان بشارینەوە و لەهـەر کـۆڕێکی ڕابواردنـدا بین و هەر شێواز و هۆکارێك بـەکاربهێنین بـۆ لـەبیر بردنـەوەی، ئـەوا دەرەنجامەکـەی هـەرگیز نـاگۆڕێ، فریشـتەی مـەرگ چـاودێریمان دەکـات و چـاوەڕێی فـەرمانی پـەروەردگاری خۆیـەتی تـاکو گیانمـان بکێشێ.

ئادەی کامیان نزیکترە لەژیری و لۆژیکـەوە: "ڕاکـردن لەمـەرگ و لەبیربردنـەوەی" یـا " قبـوڵکردنی مـەرگ و خۆشویسـتنی و خـۆ ئامادەکردن بۆ ئـەوەی گیانـەکانمان بـەپاك و خـاوێنی بەفریشـتەی مەرگ بسپێرین؟ "

لەنامەکەتدا باسـت لـەوە کردبـوو کـە خـەڵك بەدیـدی جیـاوازەوە سەیری ژیان دەکەن.. بانەختێکیش لەبارەی ئەم بابەتـەوە بـدوێین: فەرموودەیـەکی حـەزرەت ﷺ هەیـەو بـاس لـە حەقیقـەتو چیـەتی

(ماهیەت)ی ژیان دەکات و دەفەرموێ: ( الدنیا مزرعة للآخرة). هەر بیرێك کە لە ناو زەین و مێشکماندا تاوتوێی دەکەین، هەر یاداشتێك کە ڕێی پێ دەدەین لەناو یادەوەریەکانماندا جێی ببێتەوە. هەر دیمەنێك کە چاوانمان دەیبینن، هەر وشەیەك بەر گوێمان دەکەوێت، هەر قسەیەك دەیکەین، هەر هەنگاوێك هەڵی دەنێین، لە هەموو ئەوانەش گرنگتر هەر ئەوینێك کە لەنێوان کرۆکی دڵماندا دەیپێچینەوە... هەر هەموو ئەمانە لە تۆوێك دەچن و توانای گەشە کردنیان هەیە.

لەپاڵ ئەو هەموو ڕاست و دروستەدا کە ژماردمانن، هەڵەو لارو لادانیش هەیە.

باش هەیەو خراپیش هەیە. تەمەنی هەر مرۆڤێکیش وەك باخێك وایە، هەموو مرۆڤێك بەگوێرەی بەروبومی باخەکەی سەرمایەی دەست دەکەوێ. ئەگەر باخی پرتەقاڵت ڕواندبێ ئەوە دەڵێین: ( باخەکەت پرتەقاڵە)، دیارە بوونی هەندێ گژوگیاو گوڵ و گوڵزار بەدەوروبەریدا هیچ لە ناوەکەی ناگۆڕێ. هەروەها ئەگەر باخێکی گوڵانت ڕواندبێ دەڵێین: ( ئەوە باخی گوڵانە)، هەروا بوونی هەندێ گژوگیا بەسەر گوڵ و قەراغەکانیەوە هەرگیز ناوی ئەو باخە ناگۆڕێ.

مرۆڤیش بەهەمان شێوەیە..هەموو کەسێك بەگوێرەی ئەو کارانەی ئەنجامیان دەدات نازناوێك وەردەگرێت... ئەگەر چی لە ئێستادا بە زەحمەت نازناوێك دەبڕێت بەسەر شێوازی ژیانی هەر

کەسێکدا، ئەوەی لە مرۆدا ئەوان دەیکەن دڕو پێچەوانەیە لەگەڵ ئەوەی کە دوێنێ کردویانەو هەر ڕۆژە لەسەر کارێکن... هەر بۆیە دەبینی باخی تەمەنیان چەندەها جۆر ڕووەکی زیانبەخش و سوودبەخشی تێدا کۆبووەتەوە... گوڵ و دڕك پێکەوە تێکەڵن و داویانە بەیەکدا... زۆر کەس ئەمڕۆ هەر لە بیروباوەڕو هزریانەوە تا دەگاتە بەژن و باڵاو جل و بەرگیان بوونەتە مەتەڵ و کەس لێیان لێ ناگات.

ئەوەندەی ئێمە لە فەرموودەکە تێ بگەین ئەو تەمەنانە دەبێ یان باخێکی باش و بەسوود بن یان خراپ و بێ سوود، دیارە چنینی بەری یەکەمیان خۆشی و شادی لێ دەکەوێتەوە و دووەمیشیان پەژارەو پەشیمانی.

بەڵێ لەیلا!... ئەم جۆرە مرۆڤە لاواز و هەژارە لەبەردەم تاقی کردنەوەیەکدایە... حیساب و لێ پرسینەوە چاوەڕێی هەموانە. کەواتە باقسەو قسەلۆکی هەندێ کەس بخەینە لاوە و هەوڵ بدەین باخەکەی تەمەنمان باخی گوڵ و گوڵزار بێت. با ڕەنج بدەین بۆ ئەوەی ئەو ڕێگەیە بدۆزینەوە کە بەرەو بەختەوەری ئەو دنیامان دەبات.

لەیلا ئەوەیشت لەبیر نەچێ کە ئێمە تاکو زیاتر لەم دنیایەدا بەخۆماندا بچینەوە و موحاسەبەی خۆمان بکەین، لەو دنیادا موحاسەبەمان ئاسانتر دەبێ... هەتاکو دوورتر بکەوینەوە لە چێژە

حەرامەکانی دنیا ئـەوا پەڕینـەوەمان لەسـەر پـردی سـیرات ئاسـانتر دەبێ، خۆ تا خۆمان بە ئازاد بـزانین لـەو کارانـەی کـە دەیانکـەین و وابزانین هیچ سانسۆر و سـنورێك نییـە بـۆ ڕەفتارەکانمـان و تـەرز و شێوازی ژیانمان و گوزەرانمان، ئەوا زیـاتر پێکـی تـاڵاوو سەرشـۆڕی نۆش دەکەین.

تاکو لەم دنیایەشدا زیاتر لەخودا بترسین ئـەوا لـە ڕۆژی حیسـابدا زیاتر سەرمان سووك دەبێت و ئاسوودەو بێخەم دەبین، ئـەو دنیـایش – چ بەهەشـتێکی جاویـدان بـێ یـاخود دۆزەخێکـی هەمیشـەیی – ڕەنگی بەروبوومە جۆراو جۆرەکانی ئەم دنیایەمان دەگرێ. مەیـدانی ترسـناکی مەحشـەریش وا چـاوەڕێی یـاخی بـووان و چـاوەڕێی پەیڕەوانی خودایە..

بەڵێ لـەیلا! هێشـتا چـەند مـەنزڵێکی زۆر لـە پێشـمانەوە هـەن، تێپەڕاندنی ئەو مەنزڵانەیش بە بێوەیی یان گرفتاری تا ڕادەیەکی زۆر لەدەست خۆماندایە..

زۆریش ناسۆر و بەسـۆیە: لـەبیر چـوونەوەی ئـەو هـەموو پـرس و باسانەو خۆ گەوزاندن لەناو چێژو خۆشـیەکانی دنیـا و خەڵـەتان بـە قسـەی لـوس و پیاهەڵـدان و ستایشـی ڕواڵـەتی کەسـانی ڕیابـاز کـە ڕاستگۆیی تێدا نییە و بۆن و بەرامەی هەواو هەوەسی لێ دێت، ئەمـە لەکاتێکدا خۆیشیان سبەینێ دەبن بە خاك...دەبێ چەند سەخت بێ مرۆڤ ئەو هەمووشتانە لەبیر بکات و بەسیفەتی سەرپێچی کار بمرێت.

زەنگێکی خودایی لەم بارەیەوە هەیە کە دەفەرموێ: ﴿ومَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلاَّ لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَلَلدَّارُ الآخِرَةُ خَيْرٌ لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ أَفَلا تَعْقِلُونَ؟﴾ الأنعام:٣٢.

دنیا بە ئاخیرەتیشەوە موڵکی خودایە...ئەی جگە لەو کێ خاوەنی ئەم بوونەوەرەیە کە نە ئەوەڵی هەیە و نە ئاخیر؟ ئەی کێ دەیتوانی ئێمە بنێرێ بۆ ئەم دنیایەی کە موڵکی خۆیەتی؟

ئاخیرەتیش هەروا دنیایەکی ترە و موڵکی خودایە و هەر خۆیشی ڕەوانەی ئەوێمان دەکات... بە مردنیش ئێمە بەتەواوی لە ویستی خۆمان جیا دەبینەوە و بمانەوێ و نەمانەوێ دەگوازرێینەوە بۆ ئەو دنیا. جا مادام ئێمە دەڕۆین بۆ ئەوێ و لەو مەیدانەدا ڕادەوەستین، کەواتە چ ئەرکێ وا لە ئەستۆی مرۆڤی ژیرو فامیدەدا تا ئەنجامی بدات؟ بێگومان دەبێ ڕاو بۆچوونە کەسیەکانی خۆی بخاتە لاوە و شوێن ڕێبازی خودا بکەوێ کە بە (الصِّراط المستقيم) وەسفی کردووە، دەبێ ئەوەیشی لەبیر بێت کە لەم دنیایەدا ڕێبواری ڕێگەیەکە بەرەو ئەو دنیا.. دەبێ هێندەی چاوترووکاندنێك لەمە بێ ئاگا نەبێو فەرامۆشی نەکات...هەر بۆیە ئایەتەکە بە ( أفَلا تَعْقِلُون ) کۆتایی پێ دێت.

لەکاتێکدا کە ئایەتەکە ڕوونی دەکاتەوە ژیانی دنیا گەمەو گاڵتەوگەپە، فەرموودەیەکی پیرۆزیش هەیە ڕوونی دەکاتەوە کە پێویستە بزانین ئەم ژیانەی دنیا میوانخانەو کاروان سەرایەکەو ئێمەش ڕێبوارین.. ئەوەتا بێ ویستی خۆمان سواری پشتی گۆی

زەمین بووین و گەشت دەکەین.. خاوەن و موڵکداری ئەم دنیایەش کە بەدیهێنەری ئێمەیە لەوە ئاگادارمان دەکات کە ئاخیرەت جێگەی مانەوە و جێگیربوون و کۆتایی ئەم سەفەر و کاروانەیە.

کەواتە لەیلا! تۆ بڕوانە بۆ ئەو کەسانەی کە تەمەنی شیرینیان لە ڕابواردن و نەوسنی و هەواو هەوەسدا بەسەر دەبەنو تەواوی دەکەن.. ئەوانە ڕێبوارێکن کاروانەکەی خۆیان لەبیر چووەتەوە، تۆ خۆزگەیان پێ مەخوازە و هەروا دوژمنایەتیشیان مەکە.. بەڵکو ئەگەر دەتوانی بەزەییت پیایاندا بێتەوە و هەوڵ بدە یارمەتیان بدەیت و بیریان بخەیتەوەو ڕێنومایيان بکەیت بۆ خوێندنەوەی ئەم پەڕاوەی گەردوون.

پێیان بڵێ: کاتێ دارێك بەر دەگرێت و زەوی شین دەبێت و دایکێك منداڵی دەبێت، ئەم کارانە لەیەك دەچن، بکەرێك هەیە ئەم هەموو کارانە ئەنجام دەدات، دەبێ ئەمەیان لەبیر نەچێت.

پێیان بڵێ کە: ژیانی سەر ئەم زەمینە میوانخانەیەو ئەوانیش میوانن، دارەکانی سفرە و خوانێکن و بەروبومەکەیان خۆراکە، ئەوانیش دەبێ سوپاسگوزاری بەدیهێنەری خۆیان بکەن لە سەر ئەو هەموو خەڵات و بەرات و چاکە و بەخششەی، نەك لێی یاخی و بەلەسە بن، هەموو ویژدانێکی زیندوو ئەوە بەئەرك و کاری خۆی دەزانێ، ئەم ئایەتەی قورئانیان بۆ بخوێنەرەوە: ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَلَقَدْ وَصَّيْنَا الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ وَإِيَّاكُمْ أَنْ اتَّقُوا اللَّهَ وَإِنْ تَكْفُرُوا فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَكَانَ اللَّهُ

غَنِيّاً حَمِيداً ﴾ النساء:١٣١. جا بۆ ئەوەی هیچ کەسیان نەپرسێت و بڵێ:
ئەی بۆ خوای تەعالا داوامان لێ دەکات شەرمی لێ بکەین و نافەرمانی
نەکەین؟ ئایا ئەو پێویستی بەوەیە؟ هەر بۆیە خوای تەعالا خۆی
پێش وەخت وەڵامی ئەو پرسیارە دەداتەوە تا ئەو گومانو وڕێنەیە
نەهێڵێ، ئەوەتا دەفەرموێ هەرچی لە ئاسمانەکان و زەمیندا هەیە..
کە مرۆڤیش بەشێکە لەوان.. موڵکی خودایە.. هەر خۆی ئەم
مرۆڤەی بەدی هێناوە و کردویەتی بە دوایین بەروبوومی ئاسمانەکان
و زەمین، هەر خودایە کە هەموو هەلومەرج و پێداویستیەکانی بۆ
ژیانی مرۆڤ ساز و دابین کردووە پێش ئەوەی بێتە سەر زەوی، هەر
خودایە هەموو پێویستیەکانی مرۆڤ لەم سەرزەمینەدا تێروتەسەل
دەکات.

لەیلا بیربکەرەوە! ڕابمێنە لەم ئاسمانە شینەو، لەم خۆرە
پرشنگدارە، لەم دارستانە سەوزانە، لەم دیمەنە ئەفسوناویەی
دەریاکان... وا دابنێ کەسێکی نابینا هەیەو هیچ زانیاریەکی
سەبارەت بەم دیمەن و سیما جوانانە نیە، کتوپڕ بینایی چاوانی بۆ
گەڕایەوەو بەوپەڕی سەرسامی و پێزانینەوە دەستی کردە
وردبوونەوە و ڕامان، جا ئایا کاتێ ڕەنگو دیمەنەکانی ئەم هەموو
جوانییە دەبینێت هیچ دەبێتە هۆی زیادبوونی ئەو دیمەنە جوانانەی
کە لەبەر چاواندا نمایش کراون؟ بێگومان نەخێر.. چونکە نە
بریسکەی خۆر بەگەڕانەوەی چاوی ئەو زیاد دەکات و نە ئاسمانیش

شینابیەکەی زیاتر دەبێت، تاقە کەسێك لێرەدا قازانجی کردبێت هەر ئەو کەسە کوێرەیە کە چاوەکانی بۆ گەڕاوەتەوە.

هەروەها ئەو کەسەی کە پاش بەسەربردنی چەندین ساڵ بە مەینەتیو دەربەدەریو سەرگەردانیەکی زۆرەوە لەناو ڕێو ڕێبازە ناڕاستەکاندا، ئێستا ڕێگەی ڕاستی خودا دەگرێتە بەر بێگومان چەندین ئەوەندەی ئەو کوێرە دڵی خۆش دەبێت، خۆ بێگومان خودا هیچ ئاتاج و موحتاجی ئیمان و پەرستشی ئەوکەسە نییە، لێرە تاکە براوەو سەرکەوتوو هەر ئەو کەسەیە کە ڕێی ڕاستی گرتەبەر، بەلاّم خودایش ڕازی یە بەچاکەکاری و زویرو ناڕازی یە لەخراپەکاری.

خۆشویستنی خودا چاکەیەو ترسانیش لە خودا هەر چاکەیە، چونکە یەکەمیان مرۆڤ هان دەدات بەرەو کردارە چاکەکان، بەلاّم دووەمیان ڕێدەگرێت لەوەی کە مرۆڤ خراپەو تاوان ئەنجام بدات...دیارە بەختەوەریی هەمیشەییش تەنیا بەوە دەست دەکەوێت. هەر مرۆڤە کە لە بەهەشتدا بەختەوەر دەبێت و هەر ئەمیشە لە دۆزەخدا بەدبەخت و چارەڕەش دەبێت.

کەواتە کە مرۆڤێك خودای خۆش بوێت و لێی بترسێ، دیارە قازانجەکەی بۆ خۆی دەگەڕێتەوە، خودایش لەهەموویان بێنیازە.

ئەمە بەهاوەڵەکانت بڵێ و، بەبیریان بهێنەوە کە مرۆڤ بەندەی خودایە... لەم بوونەوەرەشدا هەموو بەدیهێنراوێك ئەرکێکی پێ سپێردراوەو بەردەوام سەرقاڵ و سەرگەرمی کاری خۆیەتی، کەواتە

چۆن بڕوا بکرێت کە مرۆڤ بەری بۆ بەرەڵلاکراوە و لەم ژیانەی دنیادا بەرەڵلایەو هیچ ئەرك و کارو فەرمانێکی پێ نەسپێردراوە؟

ئا لەم خاڵەدا چەندەها ڕای کەسیی پێشنیار دەکرێن و، لەوانەشە ڕاوبۆچوونی جیاواز لە بارەی دیاری کردنی ئەرك و فرمانی ڕاستەقینەی مرۆڤەوە سەر هەڵ بدەن... لەبەرئەوە بە چاکی پێناسەی حەقیقەتیان بۆ بخوێنەوە... ئەوەشیان بەبیر بهێنەوە کە: ئەو مرۆڤەی کە سیفەتی بەندایەتی هەڵگرتووە ناتوانێ بەئارەزووی خۆی ئەرك و فرمانی خۆی دیاری بکات، ئەگەر ئەوەی کرد ئەوا هەرگیز ناوی (فرمان) نابرێت بەسەر کارەکەیدا، ئەم دەسەڵاتە تەنها تایبەتە بە خوداوە، تەنها خۆیەتی کە دەتوانێ ئەرك و فرمانی مرۆڤ و هۆکاری بەدیهاتنی دیاری بکات. هەروا ئەم ئایەتە پیرۆزەشیان بۆ بخوێنەوە: ﴿ومَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ﴾ الذاريات:٥٦.

هەروەها لێیان بپرسە: چ کارمەندێك دەتوانێ فەرمانەکانی سەرۆکەکەی فەرامۆش بکات و بیانخاتە لاوە و خۆی کار بۆ خۆی دیاری بکات؟ چ قوتابیەك دەتوانێ وانەکانی مامۆستاکەی فەرامۆش بکات و بڕوات چەند کتێبێکی تر بخوێنێتەوە کە خۆی دیاری کردوون؟

لەسەر قسەکانت بڕۆ و بڵێ: خۆ ئێمە ئەم هەموو شتانە دەزانین، کەواتە چۆن هەوڵی ئەوە دەدەین کە خۆمان ئەرکی بەندایەتیمان دیاری بکەین؟ هەندێ لە توێژەرانی قورئان پێیان وایە

وشەی(عیبادە) کەلە ئایەتەکەدا هاتووە بەمانای ناسین (مەعریفە) دێت واتە ناسینی خودا، ئەم فەرموودە قودسیە پیرۆزەیشیان کردووەتە بەڵگەی خۆیان کە دەفەرموێ: ( ماخَلَقْتُ الخَلْقَ إلاّ لِيَعرِفوني ) (واتە: من بەدیهێنراوەکانو بوونەوەرانم بۆ ئەوە دروست کردوون کە بم ناسن.) چەمکی پەرستنیشیان بە ئاکامێکی ئەو ناسینە ژماردووە.. واتە هەرکەسێ کە خوای تەعالا بناسێ دیارە بێگومان بەگوێی دەکات و پابەندی فەرمانەکانی دەبێت و لە رێگریی‌و قەدەغەکانیشی دوور دەکەوێتەوە.

هەموو ئەمانە بۆ هاوەڵەکانت باس بکەو سەلامی منیشیان پێ بگەیەنە، بەڵکو لەبری من ئەم ڕستانەیشیان بۆ بخوێنیتەوە:

خۆ ئێوە تەنیا بۆ خواردن نەهاتوونەتە ئەم دنیایەوە، یان وەك گەشتیار بەم سەرزەویەدا بگەڕێن، یان بۆ ئەوەی تاریفو سەناو ستایشی کەسانی فانیی وەك خۆتان بەدەست بهێنن... خۆتان لەبیر نەچێتەوە کە مرۆڤن، هەرگیز زەین و مێشکتان خەریك مەکەن بەو دەستوورەی ئارەزووبازی (جنس)ەوە کە لەناو جیهانی گیاندارانیشدا هەیە، ئەوەشتان لەبیر نەچێت کە ئێوە بۆ ئەوە هاتوونەتە دنیاوە کە خۆشەویستی و ئارەزووی خۆتان لە کەسێکی تری ڕەگەزێکی تر تێربکەن.

ئەرکی سەرەکی و ئامانجی ڕاستەقینەی ژیانی ئێوە بریتی یە لەناسینی خواوەند کە ئێوەو سەرجەم خۆشەویستانی ئێوەی بەدی

هێنـاوه... ناسـین و ئیمـان پـێ هێنـانی و بیرکردنـهوه و ڕامـان لـه شـوێنهوارهکانی جێدهسـت و سـهنعهتی ڕازاوهی ئـهو، پـڕ کردنـی دڵهکانتان به خۆشهویستی ئهو و ئاڕاسته و ڕێنومایی کردنـی هـهموو جوڵان و وهستانێکتان بهو جۆرهی که ئهو پێی خۆشهو لێی ڕازیـه.. هیوای سهرکهوتن و پێشکهوتنتان لهم بوارهدا بۆ دهخوازم.

ههروهها هیـوای کۆمـهکی و سـهرفرازیش بـۆ تـۆ ئـهخوازم لـهیلا، بهمـهش ئـهم نامهیـهم تـهواو دهکـهم، بهویسـتی خـودا لهنامهیـهکی داهاتوودا لهبارهی (جنس)هوه بهدرێژتر بۆت دهنووسم.

والسلام علیکم..)

******

پاش ههفتهیهك ئهم نامهیهم بۆ نووسی:

بۆ لهیلای عهودالی حهقیقهت..

بهشێکی زۆری ئهو ڕوانین و دیده ههڵهیهی که بۆ ژیان ههیـه لـهو ههڵسهنگاندنه ههڵهیهوه سهرچاوه دهگـرێ کـه بـۆ چـهمکی سـێکس (جنس) دهکرێ. بۆیه ئهم نامهیهت لهسهر ئهو بابهته بۆ دهنووسم.. ئومێدهوارم بۆ خۆت و هاوهڵهکانیشت بهسوود بێت.

سێکس (جنس) چییه؟ چۆن لێی تێبگهین؟ چۆن ههڵسهنگاندنی بۆ بکهینو خۆمان لهوه لابدهین که زیادهڕۆیی تێدا بکهین؟

ئهگهر تهنیا له لایهنی ئارهزوو و شههوهتهوه سهیری ئـهم بابهتـه بکـهین، ئـهوا کـهمترین قسـهیهك لهبارهیـهوه بکرێـت ئهوهیـه کـه:

ڕوانینێکی زۆر تەسکە. منیش دەڵێم ( بەلای کەمەوە.) چونکە ئەو دیدو ڕوانینە مرۆڤ بەرەو بەهەدەردانی تەمەنی دەبات، چونکە بەئاڕاستەیەکی هەڵەدا دەیبات و پاشان... هەست بکات یان هەست نەکات.. دەیکاتە یاری و گاڵتەی دەستی هەندێ لایەن و هەندێ مۆڵگەی گەندەڵی و خراپەو بەدڕەفتاری.

بەڕاستی بێ شەرمی و بێ ئابڕوویی و بەرەڵلایی ڕەوشت: کەسایەتی لە پیاودا و پاکداوێنی لە ژندا دەکوژێ.. هەروەها کاریگەرترین و ترسناکترین چەکی بێ هۆش کردن و مەست کردنە بەدەست هەندێ هێزی ڕەشەوەو، یاریەکی گەورەیەو دەیەوێت مرۆڤ لەڕوانگەی جنسەوە تەماشای دنیا بکات و، جنس کە یاسایەکی سروشتیە بکاتە تاکە مەبەست و ئامانج لە ژیاندا.

کاتێ توێژینەوەی بابەتی جنس دەکەین پێویستە لە فراوانترین سنوورییەوە باسی بکەین. کاتێك هەورە تریشقە بریسکە دەدات و پزیسك و ڕووناکی پەیدا دەبێ... ئەم مەخلوقە تازەیە کە (پزیسك)ە ئەگەر بگونجێ بڵێین دایك و باوکی هەیە، کە بریتین لە جەمسەری موجەب و سالب. خۆ ئەگەر هەورەکان هەموویان تەنیا هەڵگری بارگەی موجەب یان تەنیا بارگەی سالب بوونایە ئەوا ئەو پزیسکە پەیدا نەدەبوو.. هەروەها ڕێکەوتنێکیش لە نێوان ئاسمان و زەمین دا دەردەکەوێت. جا بەئیلهام وەرگرتن لە برگەی (دایە زەمین) مان

دەتوانین بڵێین کە: هەموو ئەو گیاندارانەی لەسەر زەمین دەیانبینین ئاکام و بەرهەمێکی هاوبەشی ئاسمان و زەمینن.

ڕووی زەمین دابەش دەبێت بۆ وشکانی و دەریایی... جۆرەکانی ڕووەك دابەش دەبن بۆ نێرینەو مێینە.. پاشتر بناغەی خێزانیش لەسەر دوان دەوەستێت: ژن و مێرد.

دەمەوێ بڵێم جنس لە مرۆڤدا تەنیا بریتی یە لە بازنەیەکی دەستووری خوایی سەبارەت بە ( پێکهاتنی خەڵك لە دوو هاوسەر ) کەواتە دەبێ لەسەر ئەم بناغەیە هەڵسەنگاندنی بۆ بکەین و لەم گۆشەیەوە بۆی بڕوانین.

قورئانی پیرۆز دەفەرموێ: ﴿ سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ ﴾ يس:٣٦.

لەئایەتێکی تریش دا دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْ كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ الذاريات:٤٩.

ئەوانەیش کە پێشتر ژماردمانن تەنیا چەند نموونەیەکن لەوەی کە بەدیهێنراون، جووت جووتن بەو جۆرەی کە ئایەتەکان باسیان کردووە.

زاتێك هەیە کە ئەندازەو بڕیاری ئەمەی داوە ئەویش خودایەو هەر خۆی تەنیایەو پەروەردگاری هەموو جووتێکیشە.

کەواتە دەتوانین ئەو پرس و باسە بچەسپێنین بەسەر پێناسەی حەقیقەتیشدا کە پێشتر باسمان لێوە کرد و دەڵێین:

"کەواتە ئەگەر مرۆڤ لە دیدو ڕوانگەی ئەو ئامانجەوە بڕوانێت بۆ (جـنس) کـە لەپێناویـدا دروسـت کـراوە ئـەوا زۆر واقیعـی و شوێنکەوتەی ڕێبازی حەقیقەت دەبێ، ئەگینا تەنیا کەسێکی دیل و داماوی دەستی هەواو ئارەزووەکانی دەبێ."

هـەروەك چـۆن بـەو جـۆرەی پـەروەردگار ویسـتویەتی ئاسمـان بەرزکراوەتـەوەو، زەمینـیش بووەتـە لانکـەی مـرۆڤ و گیانـدارو ڕووەکەکان.. لەگەڵ جووتەکانی تریشدا هەمان حاڵەتە.

کەواتە پێویستە ژن و مێرد لـەو یاسایە دەرنەچـن. بۆیـە دەبـێ خۆیان ڕابهێنن بە گوێرەی ئـەو شێوازەی کـە پـەروەردگاریان پێـی خۆشـەو پـێی ڕازی دەبـێ. هـیچ کەسیش نێـر بـێ یـان مـێ، مـافی ئەوەی نییە لەو یاسایە دەربچێت کە خودا بۆ(جـنس) ی دانـاوەو بـە هەواو ئارەزووی خۆی لەو بـوارەدا ڕەفتـار بکـات. بـاش لـەم ئایەتـە پـیرۆزە ورد ببـەرەوە کـە پڕیـەتی لـە پەنـدو ئامۆژگـاری لـە بـارەی (جنس)ەوە: ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ﴾ البقرة:١٨٧.

پۆشـاك... چ جلوبـەرگێك... کەواتـە ژنو پیـاو هەریەکـەیان پۆشاکە بۆ ئەوی تر، هەریەکـەو ئـەوی تـر پۆشـتە دەکـات و نایـەڵێ ڕێی ڕەفتاری هەڵە بگرێت.

کەواتـە هەریەکـەیان بەهایـەکی گەورەیـە بـۆ ئـەوی تریـان و هۆکـارێکن بـۆ یـەکتر تـاکو لـە ئـەزموونو تاقیکردنـەوەی پاراسـتنی

شەرەف و ئابڕوویان لەم ژیانە کورت و کەمەی دنیادا سەرکەوتوو بن، تا چاو نەبڕنە شەرەف و ناموسی کەسی تر.

خۆ هاوسەرگیریش ڕێککەوتنی دوولایەنەیە بۆ پاراستنی شەرەف و ناموسی یەکتر، هەربەو ڕێککەوتنەش ژن وەك سپاردەیەك دەدرێتە دەست پیاو و ڕادەسپێردرێ کە چاودێری بکات و خەرجی بۆ بکێشێت و بیپارێزێ.

لەمڕۆشدا چەندین سەنتەرو مۆڵگەو دەستی نهێنی هەن هەوڵ دەدەن کە نەوەو چینو توێژێك هەڵ بخەن کە ئەم ڕاستیانەیان بەلاوە شتێکی خەیاڵی بێت، بۆیە پێویستە لاوەکانمان زۆر وریاو زیتەڵ بن تاکو نەکەونە داوی ئەو مۆڵگانەوە و گرفتار نەبن. ئەگینا ئەوەندەی تریش لاوە داماوو فریودراوەکان زیاد دەکەن کە لایان وایە ڕاستەقینەیی ژیان ئەوەیە کە پەیوەندیەکی نا شەرعی لەگەڵ ڕەگەزەکەی تردا دارێژن. ئەم حاڵەتە وێڕای ئەوەی کە ژیانی ئەو دنیای ئەو لاوانە دەخاتە مەترسی و دۆڕانەوە، هەروا هەڕەشە لەمانەوەی هەرێمەکەیشمان دەکات و بناغەکانی دەپوێنێ.

هەرکات ئەم جۆرە گەنجانە دەبینم یەکسەر یادەوەریەکی خۆمم بە بیردێتەوە:

ئەو ڕۆژە جەژنی قوربان بوو، منیش بەڕێوە بووم بۆ جەژنە پیرۆزە لە ناسراوێکم، دوو کۆمەڵە منداڵیش ئەمبەر و ئەوبەری کۆلانەکەیان گرتبوو.. فزولی خۆم بەرەو لای کۆمەڵێکیانی بردم، ئەو

منداڵانە تەماشای ئەو بێچووە مردارەوەبوەیان دەکرد کە لەزگی قۆچێکی قوربانیەوە دەرهێنرا بوو...

کۆمەڵە منداڵەکەی تریش هەروا تەماشای کۆرپەلەیەکی تری مردارەوەبوویان دەکرد... سەردانی خۆمم کردو هاتمە دەرەوە... دەبوو سەردانی خزمێکی تریش بکەم، ڕووم لە وێستگەی سەیارەکان نا، لەناو سەیارەی کرێدا بوین، وەك نەریت گۆرانی دلداری لێ دەدرا.. ئا لەو ساتەدا بیرم لەو دوو کۆرپەلە مردارەوەبوە کردەوە... بیرم لەوە کردەوە کە دایکیان نەکرایە بە قوربانی و ئەوانیش گەورە ببونایە و یەکێکیان ببوایە بەگاجوت و ئەوی تریش بەمانگا، ئەو کاتە وایشم دانا کە ئەو دوانە عاشق و شەیدای یەکتر ببونایە... لە دڵی خۆمدا وتم: گریمان یەکێکیان وەك وشە پڕوپوچەکانی گۆرانیەکە بەوی تردا هەڵدەڵێ و بەشان و باڵیدا هەڵ دەدا.. بەرگەی ئەم بیرکردنەوە نامۆیەم نەگرت و هەوڵمدا خۆمی لێ دەرباز بکەم چونکە لەدەست ئەم بیرکردنەوەیە بەزەییم هاتەوە بەو ئاژەڵە پەری و بەستەزمانانەدا و بەستەمم زانی کە ئەو جۆرە عەیب و شورەییە بدرێتە پاڵ ئەوان.

ڕاستە خۆم لەو خەیاڵە دەرباز کرد، بەڵام پاڵنەری هەستی مرۆڤانە وام لێ دەکات کە: هەر کات حاڵی پەست و پەرێشانی هەندێ لە هاوڕەگەزەکانم دەبینم پەژارە دام دەگرێت و ئازارم دەدات.

بەخۆمم وت: نەدەبوو مرۆڤ دابەزێتە ئەو ئاستەوەو، ئەرك و فەرمانی خۆی لەبەندایەتیدا و دانایی هاتنی خۆی بۆ ئەم دنیایەو مردن و دواتر ژیانی ئەو دنیایشی لەبیر بچێتەوە.. نەدەبوو ببێتە یاری دەستی ئەوانەی بازرگانی بەهەواو ئارەزووی خەڵکەوە دەکەن.

یاداشتێکی تریشت بۆ دەگێڕمەوە:

لە دوایین پۆلی قۆناغی ئامادەییدا بووم، ڕۆژێکیان کە مامۆستاکەمان هاتە پۆلەوە لەسەر تەختەکە وێنەیەکی بەدڕەوشتانە کرابوو لە پاڵیشیدا ڕستەیەکی سووكو ڕسوا نوسرابوو... مامۆستاکە بینییەکسەر ڕەنگی گۆڕا... خێرا بێ ئەوەی ورتەی لێ بێت بە هێواشی تەختەکەی سڕیەوە... دیار بوو کە زۆر زۆر تووڕەو زویر بوو.. لەسەر خۆ تەختەکەی سڕی تاکو هەوڵ بدا نەختێ هێور ببێتەوە...

چەند جارێك بە بەردەم تەختەکەدا هات و ڕۆشت.. دواجار وەستاو لای کردەوە بۆ لامان و وتی:

" ڕۆڵەکانم !.. تکایە دوور بین بن"

هیچ لە مەبەستی قسەکەی تێنەگەیشتین... پەیوەندی ئەو قسانە بە وێنەکەوە چی بوو؟ پاش کەمێك بێدەنگی دەستی کردەوە بەگفتار:

(بەڵێ، دووربین بن...هەرگیز ڕێگە مەدەن کە بیرکردنەوەتان تەنها بۆ ڕۆژی ئەمڕۆتان یان ئەم وەرزەتان یان ئەم ساڵەتان

تەرخان بکەن، بەلای کەمەوە بیر لەدەساڵ یان پانزە ساڵی داهاتوو بکەنەوە و بەخۆتان بڵێن: دەبێ ئەمڕۆ ئەو کارانە بکەم و ئەو قسانە بکەم و ئەو وێنەیە بکێشم کە ئەو کاتەی پەروەردەی منداڵەکانی خۆم دەکەم و وانەی ڕەوشت و ئەدەبیان فێر دەکەم، هەرگیز شەرم لەوەی ئەمڕۆ نەکەم و لەشەرمەزاریدا ڕوومەتم سوور هەڵنەگەڕێ.)

بێدەنگیەکی کپ و قورس ژوورەکەی گرتەوە...ئەو قوتابیەی کە وێنەکەی کردبوو ڕوومەتی تەنانەت گوێیشی سوور هەڵگەڕان...

مامۆستا لەسەر وتەکانی ڕۆشت و وتی:

"لە ئێستادا بەپاك‌وخاوێنی بژین تاکو بتوانن بەبێ تەریقی‌و شەرمەزاری تەماشای ڕووی هاوسەری ژیانتان بکەن و، لەناختانەوە دەنگێك نەبیستن و بڵێ: ئەو داماوە وا دەزانێ من پیاوێکی زۆر پیاوانەو سەر ڕاستم."

وشەکانی مامۆستا وەك بزمار خۆیان کوتایە مێشکمانەوە.

بەو وشانەی مامۆستاکەمان منیش کۆتایی بە نامەکە دێنم و ئومێدی ژیانێکی پڕ خێرت بۆ دەخوازم... ژیانێك کە مردن و ژیانی ئەو دنیات لەبیر نەباتەوە...هەروەها نامەی داهاتوویشم تایبەت دەکەم بەم بابەتەوە...

والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته.

******

دوا بەدوای ئەم دوو نامەیەی کە بەسەر یەکەوە بۆم نارد ئەم وەڵامەی لەیلام پێ گەیشت:

برا گەورەو بەڕێزەکەم:

چیتر هەست بەشەرمەزاری و تەریقی ناکەم بەوەی کە دەبمە هۆکاری ماندووبوونی ئێوە، چونکە نامەکانت تەنها تایبەت نین بەمنەوە، ئێستا تۆ لەڕاستیدا بۆ هاوەڵانی قوتابخانەم دەنووسی، واتە ئەو ڕەنج و زەحمەتەی کە ئێوە دەیکێشن تەنیا لەپێناوی مندا نییە.

لەسەر قەولی خۆتان من هەوڵ دەدەم پەرە بەخۆم بدەم و خۆم ڕۆشنبیر بکەم و بە گوێرەی وزەو توانا خۆم فێر بکەم.

ئێستا وەك پێشتر بەدەست دڵتەنگیو دڵەڕاوکەی ڕابوردووەوە ناناڵێنم، بەڵام دەتوانم بڵێم نەگەیشتوومەتە ئاسوودەییەك کە هیچ خڵتەیەکی تێدا نەبێ. ئەمجارەیان نیگەرانیەك دایگرتووم، ڕۆحم لەسەر یەك بڕیار خۆی ناگرێ و ڕاناوەستێ، جاری وا هەیە شەوق و حەماسەتێکی زۆر دام دەگرێ و بە هەموو توانامەوە هەوڵ دەدەم شتێك بکەم. جاری وایش هەیە بێ ئومێدیەکی قورس و گران بەسەرمدا زاڵ دەبێت و بەخۆم دەڵێم: تۆ چیت داوە لەوە؟ ئەرێ تۆ بەم حاڵو باڵەوە دەتوانی بە تەنیا خۆت بەر بەم لافاوی بەرەڵڵایی و بەدڕەوشتیە بگریتو بیوەستێنی؟

پاشان خۆم بەخۆم دەڵێم: " پێویستە ئەرکی خۆت بەجێ بهێنی... ئەوکاتە هەست بەچێژی ئەنجامدانی ئەرکەکانت دەکەیت... ئەوەش بەلای کەمەوە دەروون و ویژدانت ئاسوودە دەکات... تۆ ئەوە تاقی بکەرەوە و چاوەڕێی ئەنجام بکە".

بەڵام ئەم حاڵەتە دەروونیە زۆر بەردەوام نابێت، چونکە کاتێك کە حەقیقەتێك بۆ هاوەڵێکم باس دەکەم و بۆی لێك دەدەمەوە کەچی ئەو وەك پێویست بایەخی پێ نادات، ئیدی منیش دەروونم دەڕووخێ....

بەکورتی، کەوتوومەتە گێژاوێکەوە، کە ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم دەڵێی کێشەو گرفتەکانی خۆمت بۆ دەردەخەمو وەك داواکاریەکە بۆ ئەوەی تۆیش بەشداری من ببی تیایاندا، جا ئەگەر هەراسانت دەکەن ئەوا پێشتر داوای لێ بوردنت لێ دەکەم.

نامەکەی زۆر درێژ بوو...بە دوای پێشەکیدا باسی چەندین ڕووداوی کردبوو، هەندێ نموونەی ئەو گفتوگۆو مشتومڕانەی هێنابوو کەخۆی بەشداریان بووە، هەروەها ئەو ڕووداوانەی بۆ باس کردبووم کە بوونەتە مایەی بەختەوەر بوونی ئەو، منیش ئەم وەڵامەی خوارەوەم بۆ نووسی:

لەیلا خان!

نیازم وابوو کە لەم نامەیەدا شتێك لەبارەی (خۆشەویستی)یەوە بنووسم، بیروڕای خۆم ناگۆڕم، بەڵام حەزدەکەم لە پێشەوە لەبارەی

ئەو ئازارەوە بدوێم کە هەناوی تۆ بەدەستیەوە دەناڵێنیو دواتر دەگەڕێمەوە بۆ سەر باسی خۆشەویستی.

ئازارەکان ڕێبازی گەیاندنی مرۆڤن بە گوشادی.

ئەگەر تۆوێك بیەوێت ببێتە درەخت پێویستە کە خۆی بخاتە ژێر گڵ و تیایدا چەکەرە بکات...ئەو خوێندکارەی بیەوێت لەتاقی کردنەوەکاندا سەرکەوتوو بێت، دەبێ سەر بکاتە خوێندنەوە و خۆی سەرقاڵی سەعی بکات چ لەماڵەوە بێت یان لە کتێبخانە..

ئەو پەندەیش کە دەڵێ: ( فلا بُد مِن دون الشَّهدِ من إبْرِ النَّحل) واتە: ( کەسێك بیەوێت هەنگوینی دەسکەوێت، نابێ باکی لە چزووی هەنگ بێت.) هەر ئاماژە بۆ ئەو ڕاستیە دەکات.

تۆ چەندە بەختەوەری!.. لەکاتێکدا کە زۆربەی دەستە خوشکەکانت پرتەو بۆڵەیانە لەبەرئەوەی ئۆتۆمبێلیان نییە یان قاپوتێکی فەروەداری ناسکیان نییە، کەچی تۆ سکاڵای ئەوەتە کە ناتوانی هەندێ لە ڕاستیەکانی ژیان لەو خەڵکە بگەیەنیت و لەو پێناوەدا ئازار دەچێژی... دەبێ تێبگەیت کە ئەمە خەڵات و بەخششێکی زۆر گەورەیە.

هەروەك لەنامەکەی پێشوودا باسم کردووە، ئێمە بەرهەم و کاکڵەی ئەم جیهانەین کە لێوان لێوە بەچالاکی ناکۆتایی...خۆ ئەوەتا هەر لە ئەلیکترۆنێکەوە بیگرە تا دەگاتە گەلە ئەستێرەکان هیچیان لە جێی خۆیاندا جێگیر نین و دەبزوێن، کەواتە چۆن

چاوەڕێی ئەوە دەبی کە دڵ و ڕۆحت بەئارامی و ئاسوودەیی و هێمنیەکی تەواوەوە بمێننەوە؟

چونکە تۆ پەیوەندیەکی چڕ و پڕ و ئاڵۆزت لەگەڵ ئەم جیهانەدا هەیە، هاوینەکەی گەرمت دەکاتەوە، زستانەکەی سەرمات دەکات...

گەر ڕۆژەکەی پاك و ڕووناك بوو دڵخۆش دەبیت، بەڵام ئەگەر خۆڵاوی و تەپوتۆز بوو سنگت دێتەوە یەك‌و قەڵس دەبی.

ئەم جیهانەیش کە هەمووی تێکەڵ و پێکەڵ بووە بەسەر یەکدا بۆخۆی هۆکارێکی تری نائارامی و ناسەقامگیری یە.

کەواتە کاتێك کە جارێك دڵت پڕلەخۆشی و هیوا دەبێت و جارێکیش پەژارەو غەمبار، دەبێ چاك بزانی کە ئەو دڵەت نموونەیەکی بچوکی ئەو کار و چالاکیە دژبەیەکانەیە کەلەم جیهانەدا ڕوودەدەن.

شاعیر چەند جوان دەڵێت:

هەیهو..جا با نەیبینی

بەچاوانی خۆت

هیچ هەڵکشان و داکشانێك بەو جۆرە کە لەناو دڵی مندایە.

یەکێ لەماناکانی دڵ ( القلب )یش بریتی یە لە ( هەڵگەڕانەوەو گۆڕان). واتە ئەو ڕاستیە تەنانەت لەناوەکەیشیدا دەردەکەوێ. فەرموودەیەکی شیرین هەیە و زۆر بە جوانی دیمەنی گۆڕینی دڵمان بۆ دەکێشێت... من دەقەکەیم لەبەر نییە بەڵام لێرەدا ماناکەی

دەنووسم: دڵ وەك پەلی باڵی باڵدارێكە كە لە بیاباندا كەوتبێ، وەك چۆن (با) هەمیشە ئەمدیوو ئەو دیو بەو پەلە دەكات، دڵیش هەر بەو جۆرە هەمیشە ئەمدیو ئەو دیوو دەكات.)...

جا ئەگەر بەوجۆرە دڵی خۆتت ناسی و، جیهانیشت هەربەو جۆرە هەڵسەنگاند دیارە ئەوكات ڕێگەی ئاسوودەیی و حەوانەوە دەگرێتەبەر.. واتە ئەم جیهانە لانەی حەوانەوە و ئاسوودەیی نییە، بەڵكو خانەی ئەزموون و تاقیكاریە، خودای تەعالاش لە ماواو دنیایەكی تردا لانەو خانەی ئاسوودەیی و بەدبەختی ئامادە كردووەو، هەرچی چێژو خۆشی یان ئازار و بێزاری هەیە لەم دنیادا تەنیا ئاماژەو ئیشارەتێكن بۆ بەهەشت یان دۆزەخ..

دەبێ یەك سات ئەوەت لەبیر نەچێ كە تۆ بۆ ژیانێكی هەمیشەیی پاڵێوراوی و حیسابی ئەوێت بۆكراوە، هەروەها ئەركی سەرشانتە كە لەم دنیا كاتیەدا نەختێ توێشوو بخەیتە هەگبەكەتەوە بۆئەو دنیای هەمیشەیی...

ئەگەر لەسەر ئەم شێوازە بیربكەیتەوە ئەوا ئەو نیگەرانی و ئازارە دەروونیەی كەبەدەست هەرەس هێنانی ڕەوشت و ئاكاری كۆمەڵگەوە دوو چارت دەبن، ئەوانیش دەبنە پاداشت و دەچنە ناو ئەو توێشووەوە كە بۆ ئەو دنیای نەبڕاوەیە.

منیش پێش ساڵانێك چەند قاتی ئەو غەم و ئازارەی ئێستای تۆ تالاوم چەشتووە، ئەوکات جەنگی قوبروص بوو..گوێم لە مامۆستایەکی زانکۆ بوو وتی:

"ئەگەر بانگیش بکرێم بۆ سەربازی ناڕۆم، پیاو نەبم ئەگەر بڕۆم، من وەك گەلحۆیەك بڕۆم خۆم بدەم بەکوشتن کەچی گەورەو بەرپرسەکان لەناو باڕو مەلهاکاندا لەڕابواردنی خۆیان نەکەون.. نا هەرگیز شتی وا نابێ.."

ئەم ڕووداوەم بۆ برادەرێکم گێڕایەوە، ئەویش پێی وتم:

" وانەزانی ئەوە قەناعەتی یەك کەسە، ئەم قسە بەسەر زمانی هەموو ئەوانەوە هەیە کە زۆر دڵسۆزی میللەت و نیشتمان نین...تۆ تەنها تووشی یەکێکیان بوویت..."

ئەم وەڵامە زۆر غەمباری کردم...کەواتە کێشەو گرفتی ڕەوشت تەنیا لە بازنەی گوناهباری و هەڵکردنی ئاڵای سەرپێچیدا نەماوە، بەڵکو تەشەنەی کردووەو بەشێوەیەکی ترسناك گۆڕاوە بۆ بەتاڵ بوونەوەی دڵ و هەناو لەخۆشەویستی نیشتمان و نەمانی گیانی نیشتمان پەروەریی و پڕ بوونی ئەو دڵانە بەهەستی هەواو ئارەزوو.

چەند ساڵێك تێپەڕین.. کاتێ کە نامەکەت نارد بوو بۆ کتێبخانە یەکسەر هەستێك وروژاو بێداربووەوە کە: پێویستە هەناسەیەك بەم غەم و ئازارە دەروونیانە بدەم و تۆماریان بکەم و چیتر لەناخمدا

نەمێننەوە... بۆیە هەستم پێم دەڵێ کە پێویستە لەسەرم سوپاست بکەم.

لێرەدا درێژەم بەقسەکانمدا، وا دووبارە دەگەڕێمەوە سەر باسە سەرەکیەکەمان:

لێرەدا باسی لایەنێکی تری بابەتی (جنس) دەکەم کە لەنامەکەی پێشوودا بەکورتی باسم کردبوو، بەکورتی باسی (خۆشەویستی ) دەکەم.

ئیسلام ئایینییەکتاپەرستی یە، خاوەن و موڵکداری ئەم بوونەوەرە تاكوتەنیاو تاقانەیە، هەموو خێرو خۆشیەکیش لە گەنجینەکانی ئەوەوە هەڵدەقوڵێن...ئێمە هەستی پێزانین بۆ خۆر لەبەر تیشکەکەی یان بۆ زەوی لەبەر بەروبوومەکانی یا بۆ دەوڵەمەند ئەگەر بۆ خۆی شایانی ئەوە نەبێت لەبەر سامانەکەی دەرنابڕین...ئەمە ئەو وانەیەیە کە ئیسلام فێری ئێمەی کردووە.

هەر کەسێك تەنیا هۆکارێکە...کانگاو سەرچاوەی هەموو نازو نیعمەتەکانت تەنیا پەروەردگاری ئاسمانەکانو زەمینە...ئەگەر موسوڵمانە هەژارێك پاش خوێندنی ئەم وانەیە هەست بە ترس بکات لەو دەوڵەمەندەی کە سەرپەرشتی دەکات یان لەبەر سامانەکەی ڕێزی لێ بگرێ، ئەوا ئەو هەژارە بیروباوەڕی دەربارەی خوای تاكو تەنیا لەرزۆكو لاوازە.

مرۆڤەکان چ دەوڵەمەند بن یاخود هەژار، لەبەر چەند ئاکار و سیفەتێکی بەرز ڕێزیان لێ دەگیرێ وەك: ئیمان و ڕەوشتی جوان و زانایی و ڕاستڕەوی...هەرگیز سامان و دەوڵەمەندی بە تەنها نابنە هۆکاری ئەو خۆشەویستیە.

کاتێ موسوڵمانێکی دەوڵەمەندیش ئەو فەرموودەیە دەخوێنێتەوە دەزانێ کە بۆی ڕەوا نییە کەسانی تر بخاتە ژێر منەتی خۆیەوەو چاو بەرەوژێریان بکات، بۆیە چاوەڕێی هیچ ڕێز و ئیحترامێکی زیادە لەو هەژارانەوە ناکات لەبەرامبەر ئەو چاکە و کردارە باشانەی کە لە گەڵیاندا کردویەتی، چونکە دەزانێ ئەو ڕێزە زیادە تەنها کەرامەت و بەهای خۆیان ناڕوشێنێ بەڵکو دین و ئیمانیشیان پێی زامدارو زیانبار دەبێت.

پێم وایە کە مەبەستەکەمت لەلا تەمومژاوی بێت، بۆیە وا باشترە کەمێکی تر بۆت ڕوونتر بکەمەوە..

هەر کچێك کە بە عاتیفەکانی خۆی –کە ڕەنگە بە عەقڵ و ویژدان نەبێ– ئارەزوومەندی ئەوە بێت کە کوڕێك هەبێت و تەنیا بیری بەلای ئەوەوە بێت جگە لەویش باسی هیچ کچێکی تر نەکات و سەری زمان و بنی زمانی هەر ئەو بێت، کوڕێك بێ کە لێی بپارێتەوە و سۆزو عاتیفەی ببزوێنێ و، هەواو ئارەزووی ئەوە بێت کە پیاوێکی لەخۆی بەهێزتر لەبەردەمیدا لێی بپارێتەوە و بەتەمای ڕەزامەندی و سۆز و ئەوینی ئەم بێت، هەرگیز بەبیریا نەیەت کە بەم کارەی خۆی

کردووە بە شەریکی خواو ئەو گەنجەیشی کردووە بە موشریك‌و هاوەڵ دانەر بۆ خودا..

خۆ لێرەدا گوناحەکە تەنها بۆ ئەو کچە داماوە ناگەڕێتەوە، بەڵکو هەموو ئەو پیاوانەیش گوناهبارن کە هانی ئەو کچە دەدەن‌و ناچاری دەکەن تا ئەو ڕێبازە بگرێتە بەر، بەدوای ڕابواردن و گاڵتەو ئارەزوودا دەگەڕێن، بۆ ئەو نیازو مەبەستەیشیان هیچ شتێ لە " ژن "و "ئارەزوو" باشتر شك نابەن، ئەو دوانەیش باشترین هۆکار و ئامرازی بێ ئاگایین.

چەند ساڵێکە من ئەم قەناعەتەم هەیە، بەڵام لێت ناشارمەوە پرسیارێك هەیە یەخەی بەبیر و هۆشم گرتووە و دەڵێ: ئایا ڕاستە کە پیاوان تا ئەو ڕادەیەو تا ئەو پلەیە لەم بابەتەدا بەرپرسیارو گوناهبارن؟

بەڵێ، ئەم پرسیارە هەر بەبیرو خاتیرەمدا دەهاتوو دەچوو تا ئەوە بوو چەند ڕۆژ لەوەپێش چەند دێڕێکم لە پەڕاوێکی زانایەکی مەزن خوێندنەوە، ئیدی ئەو قەناعەتە لەلام جێی گرت و بووە دڵنیایی. ئەو زانا گەورەیە دەفەرموێ:

" ئەگەر پیاوان خۆیان خستە بەرگی ژن‌و خووی ژنانیان گرت، ژنانیش خۆیان وەك پیاو دەنوێنن".

ئالەم کاتەدا کە بیرو هزرم بەم بابەتەوە خەریك بوو، ئەم ئایەتە پیرۆزەی قورئانم خوێندەوە کە دەفەرموێ: ﴿ إِنْ يَدْعُونَ مِنْ دُونِهِ إِلاَّ إِنَاثاً وَإِنْ يَدْعُونَ إِلاَّ شَيْطَاناً مَرِيداً﴾ النساء:١١٧ .

لێرەدا ئەم ڕستەیە لەیەکێ لە تەفسیرەکانەوە دەهێنم کە واتایەکی زۆری هەیە: کاتێك چاو بە پڕوپاگەندەی ناموسولمانەکاندا دەخشێنی وادەزانی کە ژن لەلای ئەوان هەموو شتێکە، خۆ ئەگەر باش وردببیتەوە لەواقیعی ئەوان دەبینی کە ژن جگە لە باشترین یاری و دەسەمۆی ئەوان هیچی تر نییە.

ئەوانەی کە ژنیان لەپێگەی ڕاستەقینەو سروشتی خۆی خستە خوارەوەو کردیانە بتێك بۆ پەرستن، ئەوانە کەسانێکن کەوتونەتە نێو داو و تەڵەکەی شەیتانەوەو ڕاستیەکەی بەو حاڵەشیانەوە جگە لەشەیتان هیچی تر ناپەرستن...ئایەتە پیرۆزەکەش هەر ئەوە ڕوون دەکاتەوە.

چەندەها سەدەو سەردەم تێپەڕین کەچی هێشتا شەیتان هەر شەیتانە، دەروونیش هەر هەمان دەروون، ژنیش هێشتا هەروەك سەدەکانی ڕابردوو باشترین ئامڕازو یاری ڕابواردن و بێ ئاگایی ئەو پیاوانەیە کە دیل و بەزیوی دەستی ئارەزووەکانیانن.

نامەوێ بەدرێژی بچمە ناو ئەم کێشەیەوە، لەئێستادا ئەوە بەگونجاو نازانم. بۆیە کۆتایی بەم باسە دەهێنم و دەگەڕێمەوە بۆ سەر باسی (خۆشەویستی) تا بە چەند دێڕێك باسی بکەم:

ئایا تا ئێستا بیرت لەوە کردوەتەوەو پرسیوتە ئاخۆ: خۆشەویستی چییە؟ کێ ئەم سۆزو عاتیفەیەی لەناودڵی مرۆڤدا چاندووە؟ بۆچی ڕواندی؟ ئایا هەرگیز پرسیوتە! مرۆڤ تا چەند پلەو سنوور دەتوانێ ئەم سۆزە ناسکە بەرامبەر هەر کەسێك بەکاربهێنێ بۆ ئەوەی بە زیادەڕۆ و لەسنوور دەرچوو نەژمێررێ؟

لەناو جەستەی سنوورداری مرۆڤدا دڵێکی مەعنەوی دانراوە کە تیایدا هیچ سنورێك بۆ خۆشەویستی، ترس، ئاوات، حەز و ئارەزووەکان نییە.

مادام دەڵێین (دڵی مەعنەوی) ئیتر کەس ناتوانێ بپرسێ: مەنزڵی ئەو دڵە لەکوێدایە؟ خۆ ئەگەر ئەو پرسیارەش کرا وەڵامی بەم جۆرە دەدەینەوە: جێگەی دڵی مەعنەوی لە جەستەدا وەك جێگەی ژیریە لەناو مێشکدا.

هەریەکە لە بیستن و بینین و بۆنکردن و تەنانەت توانای تێگەیشتنیش بۆ خۆیان کەناڵێکی تایبەت و جیان، بەڵام بەروبووم و دەرەنجامی کۆتایی ئەو کەناڵانە لەناو دڵدا کۆدەبنەوە.

هەرکات مرۆڤ دیمەنێکی جوان دەبینێ یەکسەر حەزی لێ دەکات، لێرەدا هیچ پێویست بەگەڕانەوە ناکات بۆ عەقڵ...واتە لەدڵی خۆیدا ناڵێ: "ئەم دیمەنە زۆر جوانەو شایانی خۆشویستنە، کەواتە پێویستە خۆشم بوێ." واتە لێرەدا بڕیارێکی ژیرانە دەربارەی

خۆشەویستی نادات و پاشتر خۆشەویستی بکات. چونکە لەگەڵ بینینی دیمەنی جواندا یەکسەر خۆشی دەوێت و دڵی بۆی لێ دەدات.

مرۆڤ حەزی لە دەنگی بولبولە، لێرەدا بەهۆی گوێچکەوە خۆشەویستی دەگوازرێتەوە بۆ دڵ..

هەر بە هەمان شێواز (تێگەیشتن) یش دیسان هۆکارێکە بۆ خۆشەویستی، جاری وا دەبێت چەند کۆپلەیەکی جوان دەخوێنینەوە یەکسەر هەست بەجۆرە ڕێز و خۆشەویستیەك دەکەین بۆ نووسەرەکەی ، واتە لێرەدا عەقڵ ئامڕاز و هۆکار بوو بۆ خۆشەویستی..)

کەواتە دڵ گشتگیرترە لەعەقڵ، بگرە سەرداری عەقڵە...

ڕۆحی مرۆڤ ڕۆحێکە پلەکانی کامڵ بوون و چاکەکاری و جوانیی دەزانێ...بەڵام دڵەکەی دڵێکە هەموو ئەوانەی خۆشدەوێ، کەواتە ئایا مافی ئەوەمان نییە بەم جۆرەی خوارەوە بیر بکەینەوە: (زاتی خودای پیرۆز و جوان کە بەهرەی بینینی پێ خەڵات کردووین، بوونەوەریشی بە جۆرەها جوانی ڕازاندوەتەوە بۆ ئەوەی بەباشی لە جوانیەکانی بوونەوەر ورد ببینەوە و بەوەش ئەو زاتە بناسین بۆ ئەوەی خۆشمان بوێت..)

پەروەردگارمان کە بەهرەی بیستنی خەڵات کردووین، ئەم جیهانەیشی پڕاوپڕ کردووە بەدەنگ و ئاوازە خۆش و دڵکێشەکان بۆ ئەوەی بیانبینین و ڕابمێنین و بەدیهێنەری جیهانی دەنگەکان بناسین و خۆشمان بوێت...

پەروەردگارمان کە خەڵاتی عەقڵی کردووەتە دیاری بۆ ئێمەی مرۆڤ، ئەم دنیایەی هەر لە گەردیلەیەکەوە بگرە تا خانەیەك، لە گوڵێکەوە تا ئەستێرەیەك پڕپڕ کردووە لە واتاو مانای ناکۆتا، بۆئەوەی ئێمە بپشکنین و وردەکاری بکەین و ڕابمێنین لەو بەدیهاتوانەو بەوەش بگەینە ناسینی بەدیهێنەرەکەیان و خۆشمان بوێت و بە گەورەو مەزنی بزانین.

جا ئەگەر کار بەم جۆرە بێت کەواتە چۆن بۆ ئێمە ڕەوایە ئەم هەموو شتانەمان لەبیر بچێتەوەو، دەسبەرداری ئەم هەموو کاروبارانە ببین و بیانخەینە ئەولاوە و بەشتێکی ئەو تۆیان نەزانین کە شایانی بیر لێ کردنەوە بن و تەنها ڕوو لەوە بنێن کە دڵمان بئاخنین بە خۆشەویستی ڕەگەزەکەی تر..؟ ئایا ئەمە شایستەیە بۆ پایەی مرۆڤ؟!

خۆ بێگومان لەم دنیایەدا جێگەیەکیش هەیە بۆ خۆشویستنی ژن. بەڵام بەو مەرجەی کە هەموو هەست و نەست و ئامراز و ئەندامەکانی مرۆڤ لە جێگەی دروست و شیاودا دانرابن، لەم جیهانەدا کە هەموو شتێك بەتەواوی و پڕ بە پێستی خۆی لەجێگەی شیاودا دانراوە.. ئەو کاتەش لەسەر مرۆڤ واجب دەبێ کە سەرمایەو بەهرەی (خۆشەویستی) لەجێگەی دروستی خۆیدا دابنێ.

لە دەرگای ئەم بابەتە گەورەیەدا دەگەڕێمەوە بۆ سەر باسی خۆشەویستی: پێویستە لەسەر مرۆڤ کە لەبەکارهێنانی ئەم هەستە

بەنرخ و نایابەدا زیادەڕۆیی نەکات و، زیاد نەیداتە بەر، دەبێ هەر ئەوشتانەی خۆشبوێت کە شایستەی خۆشەویستین و بەئەندازەی خۆیشیان خۆشەویستیان بداتێ...

دیارە مرۆڤ ئەستێرەکانی خۆشدەوێت.. بەڵام نەك وەك خۆش ویستنی ئەو بەرو بومانەی لەباخەکەیدا هەن...لەناو باخەکەیدا ئەو میوانەی خۆشدەوێت کە لە لقەکانەوە شۆڕ بوونەتەوە.. بەڵام نەك وەکو خۆشویستنی پەنجەکانی دەستی خۆی.. هەروا دەست و پێ و چاو و گوێی خۆی خۆشدەوێت بەڵام بەوئەندازەیە نا کە عەقڵی خۆی خۆشدەوێت.. دیارە منداڵی دراوسێکەیانی خۆشدەوێت، بەڵام بەقەد خۆشویستنی منداڵەکەی خۆی نا.

ڕۆحی مرۆڤیش لەتوانایدایە کە هەموو هۆکارەکانی ئەو خۆشەویستیە لە خۆیدا جێ بکاتەوە، هەموو هۆکارەکانی بەگوێرەی ئەندازەیان خۆشدەوێت... هەرگیز دڵی هاوار و سکاڵا ناکات لەدەست کۆبوونەوە و جەنجاڵی ئەو هەموو جۆرە خۆشەویستیانە..

ئەم حاڵەتەش ئەم ڕاستیەی خوارەوەمان فێردەکات:

ئەو توانا بێسنوورەی کە دڵ بۆ خۆشویستن هەیەتی تەنها لەبەر خاتری زاتی پیرۆزی خواوەندە کە دەزانین هەموو کار و سیفەتێکی لە ئەوپەڕی کامڵی و بێ کەمو زیادیدایە... هەرچی جۆر و ڕووی جوانی کە لە بوونەوەردا هەیە هەمووی درەوشانەوەی ناوە جوانەکانی خواوەندن. لێرەشدا هەر ئەوەندەمان لەوێزەدایە کە لەم

بابەتەدا تـەنیا ئـەم ڕاسـتیە بـەرزە تۆمـار بکـەین: دڵـی مەعنـەوی " باتین" ئاوێنەی صەمەدانیەتی خواوەندە.

(صەمەد) — وەك زانراوە یەکێکـە لـەناوە پیرۆزەکـانی خواوەنـد، ماناکەی بەم جۆرەیە:

هەموو شتەکان پێویستیان بە خودایەو جێ نیازی ئەوانە، ئەویش هیچ پێویستی بەکەس یان هیچ شتێك نییـەو بـێ نیـازە، گـەورەترین پێداویستی دڵیش لە مرۆڤدا بریتییە لەوەی کە پێویستی بە ئیمان بە پەروەردگاری هەیە کە بەدی هێناوە و وێنـەی کێشـاوە و دیمـەنێکی جوانی پێ بەخشیوە... پێویستی بە خۆشویستن و لێ ترسـانی ئـەو خواوەنـدە هەیـە. هـەروەها پێویسـتی بەهەسـتی سوپاسـگوزاریو پێزانین و ستایشی ئـەو زاتـە هەیـە کـە هـەر هـەموو شـتێکی بـۆ ڕام کردووە هەر لە جەستەی خۆیەوە تا دەگاتە خۆر و ئەستێرەکان...

جگە لە خۆشەویستیو ئیمان هیچ شتێکی تـر دڵـی مـرۆڤ تەسـەل ناکـاتو تینـوێتی ناشـکێنێ.. مرۆڤێـك کـە ئـارەزووی ئەوەیـەتی خۆشەویستی لە جێگەی ڕاست و دروستی خۆیدا بـەکاربهێنێ دەبـێ یەکـەمجار زۆرینـەی ئـەو خۆشەویسـتیەی ڕوو بکاتـە پـەروەردگار و بەدیهێنـەری خـۆی.. دەبـێ بەدیهێنـەری خـۆی خـۆش بوێـت و بەدیهاتوانیشی هەر بە ناوی ئەو خۆشەویستیەوە خۆش بوێت.

لـەم ڕۆژگارەمانـدا کاتـێ باسـی خۆشەویسـتی دەکـرێ، ئـەوەی یەکەمجار دێت بەبیرو مێشـکی خەڵکدا ئـافرەت و هـەواو ئـارەزووە،

بۆیـە دەتـوانین وەك حاڵـەتێکی نەخۆشـی و جۆرێـك لەهـەرەس و دارمانی ڕۆحی و دەروونی سەیری بکەین.

باهەر لە سەرەتاوە لەوە دڵنیابین و باش بزانین کە ئەگەر بەفەزڵ و چاکەی خودا نەبێت ئەوا ناتوانین تـامی هـیچ خۆشـیەك بکـەین بـە خۆشەویستی ژن یان پیاویشەوە. خۆ ئەگەر ئـەو بـەجووت بـەدیمان نەهێنێ چۆن دەتوانین بـزانین یـان تـامی خـۆش ویسـتنی (ژن) یـان خۆشویستنی (پیاو) بکەین؟

﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ الروم:٢١، واتـە: ( هەر لە نیشانانی ئەوە کە لە خۆتان ئاوجوتی بۆ بەرهـەم هێنـاون، کـەپێیان بحەسـێنەوە و خۆشەویسـتی و ئـەوینی خسـتۆتە ناوتـان. لەمەدا بۆ کەسانێ کە بەوردی سەرنج بدەن، بەڵگە زۆرن.)

ئاشکرایە کە مانای (بەڵگە) دەلیل و نیشانەیە.

کاتێ کە لەم بوونەوەرە ڕادەمێنین دەبیـنین هـەموو شـتێ تیایـدا ڕێك هۆنراوەتەوە و لە جێگەی شیاوی خۆیدایە، یاسایەکی ناوازەیش چـواردەوری هـەموو شـتێکی داوە، ئەمـەش بەڵگەیـە لەسـەر بـوونی یاسادانەرێك، هەروەها شتانێك کە هیچ ژیان و هەست و نەستێکیان تێدا نیە، کەچـی کـاری وەهـا ئـەنجام دەدەن پێویسـت بـە هەسـتو نەست دەکات، دیسان ئەمەش بەڵگەیەکی تـرە... هـەموو ئـەو شـتە جوان و ڕازاوانەشی کە لەبونەوەردا هەن پێویستیان بەئارایشـدەرێك

هەیـە، هـەموو بەخشـش و خـەلات و بەراتـەكانیش پێویسـتیان بـە جوامێر و نیعمەت بەخشێك هەیە، ئەمانەیش دیسان بەلگەی ترن...

هەر ئایەتێكیش لە ئایەتـەكانی قورئـانی پـیرۆز بەلگـەو نیشـانە و هێمایەكـە بـۆ ڕاسـتیەك لەڕاسـتیەكان...ئـەم ئایەتـەیش كـە پێشـتر ئاماژەمـان پێكـرد وانەیـەكمان دەداتــێ لـەبارەی بەلگەیەكـەوە كـە دەمێكە ئێمە لەبیرمان چووەتەوە كە بریتیـە لـە بـە جـووت دروسـت كردنـی مـرۆڤ و ئەفرانـدنی سـۆز و خۆشەویسـتی لـە نێـوان ئـەو دوو جووتەدا، ئای ئەم سۆز و بەزەیی و میهرە چەندە جـوان و ناسـكە و چ نیعمەتێكی مەزنە...

ئەگەر خودا هێزی بینینی پێ نەدابنایە ئێمە چیمان دەبینی؟ خۆ ئـەوەتا چـەندەها ڕەگـەزی زۆر هـەن و ئێمـە نایـانبینین وەك: ڕۆح، ژیـری، فریشـتە، شـەپۆلی موگناتیسـی. ئەگـەر هێـزی بیسـتنی پـێ نەبەخشینایە چیمان دەبیست؟ خـۆ ئـەوەتا چـەندەها دەنـگ هـەن و ئێمـە نایانبیسـتین چـونكە بیسـتنمان سـنووردارەو لــەدەرەوەی سنوورێكی دیاری كراوی لەرە دەنگیەكاندا هیچ دەنگێك نابیستێت.

هەروەها ئەگـەر خۆشەویسـتی نەخسـتایەتە دلـی مرۆڤـەوە ئێمـە چیمان خۆشدەویست؟

ئەوەتا زۆر جۆر خواردن هەیەو ئێمە بێزیان لێ دەكەینەوە كەچـی ئـاژەلانی تـر زۆر بـە چلێسـیەوە تـەپ دەكوتنـە سـەریان. چـەندین

گیانداریش هەن و ئێمە بێزیان لێ دەکەینــەوە کەچی گیانـدارانی تــر کەیفیان پێیان دێت.

ئـەو داناییـەی کـە گـۆلاوو چـاڵی پیســی لـەلای سیســرکو مەگـەز خۆشەویست کردووەو، خواردنی مشکی لەلای پشیلە خۆش کردووە، هەر ئەو داناییـە دەیتـوانی چـەندین شـتی ترمـان لـەلا خۆشەویسـت بکات جگـە لەوانـەی کـە ئێسـتا خۆشمـان دەوێـن‌و، ئەوسـا ئێمـەش خۆشمان نەدەویست و سوپاسگوزاریشمان نەدەکرد.

کەواتــە ئـەو خۆشەویسـتی‌و میهـرو سـۆزەی کـە لـەنێوان ئێمـەدا دانراوە تـەنهاو تەنها شوێنەوارێکە لە شوێنەوارەکانی چاکەی خـودا.. ئایا چاکەو خەڵاتی ئەو نەبوایە هەرگیز هیچ پیاوێك بەرگـەی ئـەوەی دەگرت کە ژنێك و کۆچێك منـداڵ ببنــە برابـەش و هـاوخوانی ڕۆزی و کارو قازانجەکانی و ببنە کۆڵ و بار بەسەرشـانیەوە؟ ئایـا دەیتـوانی بەرگەی گرفت و پێداویستیەکانیان بگرێت؟ خۆ ئەمە لـە گۆشـەیەکی ترەوە سەبارەت بە ژنیش هەر ڕاستە.

خودای گەورە کاتێك وەچەو زۆربوونی مرۆڤـی بەسـتووەتەوە بـە پەیوەندی نێوان ژن و مێردەوە لەبەر بەدیهاتنی ئـەو ئامانجەیـە کـە خۆشەویستی و سۆز و ئەوینی خستووەتە نێوان ئەو دوو ڕەگەزەوە.

ئایەتەکە لەکۆتاییەکەیدا ئەوە ڕوون دەکاتەوە و دەفەرموێ: ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾.

ئەگەرچی ژن و پیاو لەیەك جۆرن، بەڵام چەندین جیاوازی جەستەیی و ڕۆحی لە نێوانیاندا هەیە. هەموو ئەو جیاوازیانەیش خزمەت بە بەردەوام بوونی وەچەی مرۆڤایەتی دەکەن. هەریەکە لەو دوو ڕەگەزەیش بەجۆرێ بەدیهێنراون و ساز کراون کە بەتەواوی گونجاو و لەبارن بۆ ئەوەی بەباشترین شێوە ئەو فرمانە ئەنجام بدەن.

یەکێ لە گەورەترین و بەربڵاوترین مەترسیەکانی ئەم سەردەمەمان ئەوەیە کە خۆشەویستی ژن بە هەڵە بەکاردەهێنرێت.

مادەم ئەو شتانەی کە لەناو بازنەی حەڵاڵدا هەن جوانترین شتن، وەك: قازانجی حەڵاڵ، پارووی حەڵاڵ، کاسبی حەڵاڵ و قسەی ڕاست.. کەواتە وا پێویستە هەر ئەو یاسایەیش بەسەر بابەتی خۆشەویستی نێوان ژن و پیاودا بچەسپێنین، بەڵام جێی داخە کە زۆرێك لەلاوەکانمان ناتوانن وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە: (بۆچی ژنت خۆش دەوێ؟)

دەتوانین بەم جۆرەی خوارەوە ئەو پرس و بابەتە هەڵسەنگێنین کە لە ئایەتە پیرۆزەکەی پێشەوە وەرمان گرتبوو:

خودا خۆی ژنی لەلای پیاو و پیاوی لەلای ژن خۆشەویست کردووە... هەر بۆیە ئەم خۆشەویست کردنە خودایییە لەناو بازنەی حەڵاڵدایە و لە پێناوی حەق و چاکەو لەبەر خاتری بەهەشتە.

بەڵام ئەوین و دڵداری نا شەرعی ناچێتە ناو بازنەی ئەم خۆشویستنەوە. ئەوە دڵدارییو ئەوینێکی شەیتانیە نەك خۆشەویستیەکی خودایی، ئەم فەرمایشتە پیرۆزەیش کە دەفەرموێ: (النساء حبائل الشیطان) واتە: ژنان تەڵەو داوی شەیتانن. بە کورت بڕیەکی ڕەوانبێژانەی بەرزەوە ئاماژە بە ئاکامی دژوارو ناخۆشی ئەوانە دەکات کە دەکەونە بیرو زەلکاوەکانی ئەو ئەوینەوە.

ئافرەت نابێ وەك ژنێك خۆش بویسترێت تەنیا لەلایەن مێردەکەیەوە نەبێ، هەر خۆشەویستی و ئەوینێکیش لەدەرەوەی سنووری ئەم خۆشەویستیەوە گیرۆدە بوونە بەتەڵەو داوەکانی شەیتانەوە.

ئێستاکەش کچێکی لاو هێشتا ئەو کەسە ناناسێ کە شووی پێ دەکات و هێشتا چەند ساڵێکی تریش لەبەردەمدا ماوە تا خوێندن تەواو دەکات و نازانێ کێ دەمرێ و کێ دەژی، سووریش دەزانێ کە لەنێوان سەدان پیاودا کە ئارەزوویان بۆخۆی دەجوڵێنی دەبێ تەنیا شوو بە یەکێکیان بکات، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا سڵ ناکاتەوە لە لەبەرکردنی جلوبەرگی ئابڕوبەرانە... ئەم جۆرە کچۆڵەیە هەرگیز پەی بەمانای ڕاستەقینەی خۆشەویستی نەبردووە، بگرە بوورەتە داوو تەڵەی شەیتان بۆ کوڕە لاوەکان.

شەیتانیش بەم تەڵەو داوە دەتوانێ ڕاوی شەرمو شکۆ و پاکیی سەدان لاو بکاتو و گرفتاریان بکات.

جا پاش ئەوەی ئەم کچە لاوە هەڵدەستێ بە تێکدانی خەیاڵو وێران کردنی هەناوی زۆرێك لەلاوەکان، کەچی دەبینی پەیوەندیەکی ناشەرعی لەگەڵ یەکێکیاندا دەبەستێ تا دەبنە هاوسەری یەکتر، تەنانەت ئەگەرچی ئەم پەیوەندیە سەری لە هاوسەرگیریشەوە دەرچێ، دەبێ لەبیرمان نەچێت کە چەندین ساڵی گوناح و سەرپێچی لەدوای خۆیەوە بەجێ دەهێڵێت. بەڵام زۆرینەی ئەم پەیوەندیانەش زۆربەی جار (لەبەر هەر بیانوو هۆیەکی لاوان) بە خۆدزینەوە لە هاوسەرگیری کۆتایی پێ دێت...ئەوکاتەش هەردولا ئازار و پەژارەی ویژدان دەچێژن، باسزای سەختی ئەو دنیاش بووەستێ.. بەهەرحاڵ لەوە دەچێ نەختێ لەبابەتەکەش دەرچووبم...با بگەڕێینەوە بۆ سەرباسەکە.

فەرموودە پیرۆزەکە کە ژن دەچوێنێ بە( تەڵەی شەیتان) بەوە هەموو ژنان و هەروا پیاوە ئارەزوو پەرستەکانیش لەوە وریا دەکاتەوە کە بەم ڕەفتارە ناپەسەندەیان تووشی چ داوێك دەبن. فەرموودە پیرۆزەکە ئەو پیاوانە کە دیلی ئارەزووەکانی خۆیانن دەشوبهێنی بە ماسیەکی دەربەدەر کە کەوتبێتە ناو تۆڕو داوی شەیتان و ڕاوچیەوە.

لـەيلا، خۆيشـت چـاك دەزانـی كـە هـەروەك (ئيمـان) دژی بـێ باوەڕيە، هەروا سەرپێچيش دژی گوێڕايەڵييەو ئـەو دنيـاش دژی ئـەم دنيايە...

چەندێك لـە يـەكێكيان نزيـك ببيتـەوە ئەوەنـدە لـەويتريان دوور دەكەويتەوە...تا لـە گوێڕايـەڵی نزيـك ببيتـەوە، لەسـەر پێچـی دوور دەكەويتەوە، تا ئيمانت بەهێزتربێت لە بێباوەڕی دوور دەكەويتەوە، هەربەو جـۆرەش تـا بـە دنيـادا بنوسـێيتو خـۆتی پيـادا هەڵواسـی، پەيوەندی و پەيوەست بوونت بەو دنياوە لاواز دەبێ، هەتاكو چێژ و خۆشـيەكانی دنيـا لـەناو دڵتـدا ڕيـزی پێشـەوەيان گرتبـێ، زيـاتر بەختەوەری و خۆشی ئەو دنيات بەلاوە بێهودەو گاڵتە دەبێ...

ئێمە لێرەدا: باس لەو دنيايە دەكەين كە دەبێتە كۆسپو پـەردەو ڕێگر لەبەردەم ئەو دنيا، ئەو فەرمايشتە پيرۆزەيـش كـە دەفـەرموێ (حُبُّ الدُّنيا رَأْسُ كُلِّ خَطيئَة) هەر ئاماژە بۆ ئەو جۆرە دنيايە دەكـات. بۆيە بەم چـەمك و تێگەيشـتنەوە پـێم خۆشـە نـەختێ لەئاسـت ئـەو ڕووەی دنيـاوە بوەسـتم كـە باسـی ژن دەكـاتو پەيوەنـدی پێـوەی هەيە.

ژن پشـكی گـەورەو ڕێـژەی بـەرفراوانی خۆشويسـتنی دنيـا پێـك دەهێنێت...چونكە گوزارشتێكی زيندووە لـەبارەی دنيـاوە.. كەچـی خۆشی و شەيداييەكانی تری دنيـا وەك سـامان و دەسـەڵات و تـاد.. بەزمانی حاڵيان مرۆڤ بانگ دەكەن و كێشی دەكـەن بـۆ لای خۆيـان.

بەڵام ئەو بانگە لەژندا دەگۆڕێت بۆ بانگێك ترپەی ژیانی تێدایەو بانگێکی بیستراوە... واتە ژن جیهانێکی ڕازاوە و پڕە لە هەموو خشتەو فێڵ و تەڵەیەك... بەگفتاری، پێکەنین و خەندەی، بەناز و لارو لەنجەی... بۆیە بە گەورەترین ئاستەنگ و تاقی کردنەوەی بەردەم بەختەوەری پیاو دادەنرێت و قەبەترین کۆسپ و تەگەرەیە کە ڕێ بگرێت لە پیاو تا بگات بە سەرفرازی ئەو دنیاو قیامەت.

ئەوەتا هەر پیاوێك کە هەموو بایەخ و هەوڵ و تەقەلای خۆی دەخاتە کار بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئافرەتێك، وردە وردە باس و خواسی ڕەزامەندی خوای لەبیر دەچێتەوە.

خۆ من ئەمە بەو مەبەستە نانووسم کە هێرش بکەمە سەر ئافرەت یان لەپلەو بەهای ئەو کەم بکەمەوە یان توانجی لێ بدەم، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە کە وریایی و هۆشیاری تەواوت پێ بدەم کە نەکەی توخنی ئەو کارە شەیتانیە بکەوی.

خودای میهرەبان مرۆڤی تەنیا بۆ ئەوە دروست کردووە کە خودای خۆی بناسێ و خۆشی بوێ‌و هەوڵی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو بدات، بۆ ئەوەی پلەکانی ڕێبازی خواناسی بگرێتەبەرو بەوەش شایستەی بەهەشت و خۆشویستنی خوابێت.

لەبیرچوونەوە و بێئاگابوون لەم هەموو ڕاستیانەو کۆکردنەوەی هەموو ڕەنج و ئامانج و نیازو پەژارەیەکی لە پەیوەندیەکی جینسیدا

تەنیا یاریو گەپێکی شەیتانیەو شوێنکەوتنی ئارەزووی دەروونی بەدخوازە.

لە کۆتاییدا لە دەفتەری تێبینیەکانی خۆمدا پەندێکت بۆ دەنووسم:

"ئەگەر تۆ بە پەرداخێك شەراب مەست ببی، چۆن دەتوانی دەریایەك هەڵ لووشی؟".

گەنجی ئێستا شەیدای دڵۆپێك مەیە، بۆی مەست و خومارە. مەبەست لە هەڵ لووشینی دەریا بریتییە لە داچەقاندن و مەحکەم کردنی خۆشەویستی خودایی لەناو دڵدا.

مرۆڤی موسوڵمان تەنها بەناوی خوداوە هەر بوونەوەر یان بەدیهاتوویەکی خۆشدەوێ... خۆشویستنی ژن یان خۆشویستنی پیاویش لەناو بازنەی حەلاڵدا هیچ ڕێ لە خۆشەویستی خوای تەعالا ناگرێ، چونکە هەر خودا ئەو خۆشەویستیەی لەنێوان دڵەکاندا داڕشتووە.

بەم جۆرەو لێرەدا کۆتایی بەنامەکە دەهێنم، هیوادارم کە هەستی خۆشەویستی لە جێگەی دروست و شیاوی خۆیدا بەکاربهێنی....

والسلام علیکم.

*****

دوای مانگێك نامەیەکم لە (لەیلا)وە بۆهات:

ئەو نامەیەی زۆر شادمانی کردم و دڵی پڕ کردم لە ئومێد... لەمیانی دێڕەکانی نامەکەیدا دیار بوو کە زۆرتر تێگەیشتووە و پێگەیشتووە...

لەیلا لەنامەکەیدا پەژارەی خۆی نیشان دەدا لەمەڕ ئەو تێکچوونە ڕەوشتیانەی کە دووچاری لاوان بووەو، بێزاری و نیگەرانی خۆی لەوبارەیەوە دەردەخست. وتەکانی زۆر دڵسۆزانە بوون و لەناخی دڵیەوە دەرچووبوون و کتومت وەك ئەو وتانەی بوون کە پێشتر لە نامەی یەکەمیدا باسی حاڵی خۆی بۆ نوسیبووم... ئەمجارەیان پەیڤەکانی خۆی بۆ باسکردنی هەرەسی ڕەوشتی لاوانی ئەمڕۆ بەکار دەهێنا، دەیوت بەزەییم بەواندا دێتەوە و بۆ حاڵی ئەوان نیگەرانم، بەڵام بەرامبەر بەو دیاردە ناسۆرە ناتوانێت هیچ کارێك بکات. داوای هاوکاری لە من دەکرد کە ئەم حاڵەی بۆ هەڵسەنگێنم...

منیش ئەم نامەیەم بۆ نووسی:

" بۆ لەیلای عەودالی حەقیقەت...

لەم نامەیەی دواییتدا دەبینم وەك دایکێکت لێ هاتووە کە چۆن سۆزو غەم و نیگەرانی خۆی بۆ منداڵەکانی دەردەبڕێ... لەبەرئەوە پێش ئەوەی لەسەر باسەکە بەردەوام بم بە ئەرکی خۆمی دەزانم کە

پیرۆزبایی گەرمت لێ بکەم کە لەم تەمەنەی ئێستاتدا گەیشتوویتە ئەو پلەیەی تێگەیشتن و پێگەیشتن.

سەبارەت بە هەڵسەنگاندنم بۆ حاڵ و گوزەرانی ئێستای لاوان، ڕاستیەکەی نازانم لەم بارەیەوە چی بنووسم. خۆ ڕووداو و حاڵەتەکان بە بەرچاوانی هەموانەوە ڕوودەدەن و ئاشکران..

زۆر جار دەبینین لاوانی پێگەیشتووی هەردوو ڕەگەز یاری منداڵانە دەکەن، نە کچەکە وەك ئەوە هەڵس و کەوت و ڕەفتار دەکات کە سبەینێ ببێتە دایك، نە کوڕەکەیش ڕەفتاری باوکی دوارۆژ دەکات.. کاتێ کچەکانمان لەگەڵ کوڕەکاندا قسە دەکەن دەبینی بۆ نوکتەیەکی سادەی بێ کەڵکی کوڕەکە، ئەو کچە لەپێکەنیندا وەختە بکەوێت بەپشتدا، ئەمە لەکاتێکدا ئەو نوکتەیە تەنیا بزەیەکی سادەیشی بەسە، کوڕەکانیش لەبەرامبەریاندا بەزۆر خۆیان دەهێننە پێکەنین.

ئومێدەوارم وانەزانی کە من بەم قسانە ڕقێکم لەلاوان هەڵگرتبێ، چونکە من دژیان نیم، بەڵکو دژی ڕەفتار و هەڵس و کەوتیانم. ڕاستیەکەی من بەزەییم پیایاندا دێتەوەو دڵم بۆیان دەسوتێ، لەناخی دڵیشمەوە ئاواتی ڕزگاربوونی ئەوان دەخوازم، لەم بارەیەشەوە بەردەوام ئومێدم هەیەو هەرگیز نائومێد نابم، چاکیش دڵنیام ئەو لاوەی کە هەمیشە قاقاو تریق و هورپەتی و گاڵتەو گەپ دەکات، حەز و ماخولیانی ئەوەیەتی ئەو بۆشاییە ڕۆحیە پڕ بکاتەوە

کە هەستی پێ دەکات، هەروەها لەوەش دڵنیام کە ئەو لاوانە لەجێگەیەکی هەڵەدا بەدوای دەرمانی دڵیاندا دەگەڕێن.

بەڵام مادام تۆیش هەست بەئازار دەکەی بەرامبەر بەو لاوانە و دڵت بۆیان دەسوتێ، ئەوا تکات لێ دەکەم ئەم هەست کردنە زۆر بە چاکی هەڵسەنگێنی و بنرخێنی، بە هەستی بەزەیی و سۆز و میهرەوە بچیتە سەر ئەم پرسە نەك بە هەستی هەڵەشانەو تووڕەیی و زویریەوە.

وا لەم بارەیەوە ڕووداوێکت بۆ دەگێڕمەوە کە منی لەناخەوە بریندار کرد...ناوی جێگەو کاتی ڕووداوەکەت بۆ ناهێنم..

کچێك لە زانکۆی شارێك قبوڵ کراو هات بۆ ئەو شارە، لەگەڵ هاتنیدا کەوتە دەستی جامباز و دەلاڵەکانی ئارەزووبازی...لەناو ئەم سەرچڵی و زەلکاوە تازەیەدا کە تیایدا دەژیا پاشەڕۆژی خۆی لەبیر چووەوە...هۆڵەکانی خوێندنی گۆڕیەوە بەجێگەکانی ڕابواردن. هۆڵەکانی کتێب خوێندنەوەی گۆڕیەوە بەجێگەکانی بیرە خواردنەوە و مەستو خومار بوون..

هەردەبوو کۆتاییەکی سروشتی بۆ ئەم ڕەفتارەی هەبێت...وای لێهات زۆر جار لە گەڕانەوەی بۆ بەشی ناوخۆی کچان دوا دەکەوت... کار گەیشتە ئەوەی کە وەخت بوو لەبەشە ناوخۆییەکان دەری بکەن. بەرپرسانی بەشی ناوخۆیی هەڵسان بە ئاگادارکردنی باوکی کچەکە لەم بابەتە... باوکی داماوی هات بۆ شار بۆ

ڕزگارکردنی کچەکەی لەو زەلکاو و لیتەو چەپەڵیانەی کە تیایاندا دەژی، گەیشتە بەشی ناوخۆی کچان و داوای کرد بانگی بکەن، پاش ئەوەی بەیەك گەیشتن و هەندێ ئامۆژگاری کرد کە دەبوو هەرزوو بیکردایە بەڵام دواکەوتبوو، بەکچەکەی خۆی وت: ئیتر مانەوەت لەم شارەدا تەواو بوو.. بڕۆ جل و کەلوپەلەکانت ئامادەبکەو ئێستە دەگەڕێینەوە. کچەکە ئەم قسانەی باوکی بەلاوە شتێکی زۆر کتوپڕو ناکاو بوون، بەڵام چاری نەماو پێی وت: باش. کچەکە سەرکەوتە سەرەوە بۆ ژوورەکەی خۆی.

ئەوەی کەڕوویدا لەچەند خولەکێکدا ڕوویدا...ڕاستیەکەی ئێمە نازانین ئەو کچە لاوە لەو ساتەوەختانەدا چ جۆرە سەرکۆنەو موحاسەبەیەکی ویژدانیانە بوو کەلەگەڵ خۆیدا کردی... هەرئەوەندە دەزانین کە قیژەیەك هات و لەگەڵ قیژەکەدا خەڵکی ئەو شوێنە بە باوکی کچەکەشەوە هاتنە دەرەوە بۆ ئەوەی جەستەی مردووی کچەکە لەسەر جادەکە ببینن.

من پێم وایە کە هێشتا هەستی شەرم لەو کچەدا نەمردبوو... چونکە ئەوەی بەلاوە چاکتر بوو لەپەنجەرەی بەشی ناوخۆییەکەوە خۆی فڕێ بداتە خوارەوەو بمرێ نەك بەڕووی باوکیدا بوەستێت و داواکەی بداتە دواوە.. جەستە بێدەنگەکەی کە لەسەر جادەکە کەوتبوو بەو خەڵکەی دەوت کە لەوێ کۆبووبوونەوە: (ئێوە بوون کە بەپاڵ منتان بەم ئاکامە شوومە گەیاند...)

بەڵێ، ئەو کچە لاوە کتوپڕ نەکەوتە ناو چنگی ئەو ژینگەو ناوەندە بیمارو نادروستەوە... بەڵکو یەکێکە لە قوربانیەکانی تێکڕای کۆمەڵگە... لەناو کۆمەڵگەیەکدا دەژیا هەرهەموویان سەری زمانو بنی زمانیان هەڵوتن بوو بەشان و باڵی ئەوین و دڵداریدا.. لە کۆمەڵگایەکدا کە گەورەترین پشکی خۆی بۆ وروژاندنی پرس و کاروباری ژن تەرخان کردووە (بەتایبەت ئەوەی کە پەیوەندی بەهەواو ئارەزووەوە هەیە).. کۆمەڵگایەك کە هەموو کاسێت و گۆرانی و کلیپەکانیان هەریەك شت دەڵێتەوە: ژن..ژن. ئەم کەش و هەوا بۆگەنەی کە دڵ و زێڵی هەریەکە لەئێمەی تووشی شێوان و بەیەکدا هاتن کردووە، هەر ئەم کەشە پیس و بۆگەنە ئەویشی کوشتووە...

ئەم لاوە داماوە (وەك سەدان و هەزاران کچی تریش) قوربانی دەستی ئەو پڕوپاگەندە بەردەوام و نەبڕاوەیە کە بەو جۆرە تەماشای ژیان دەکەن.. هەر بە تۆپزی ناچاری کردووە خۆی بدات بەدەستیەوە بەبێ ئەوەی ئەو داماوە بزانێ یان ئاگای لەخۆی بێ کە مێشك و دەماخیان شۆردووە.. کەچی هێشتا ئەو بەستەزمانانە بڕوایان وایە کە بەوپەڕی ویست و ئازادی خۆیان ئەم جۆرە ژیانەیان بۆ خۆیان دیاری کردووە و کەس ناچاری نەکردوون و کاریگەری کەسیان لەسەر نییە.

چەندەها ساڵە مێشکیان بەوە پڕ دەکرێت کە شەرم و ئابڕوو شەرەف و ناموس چەند دەستەواژەیەکی کۆنەپەرستین‌و باویان نەماوەو سواون و پاشماوەی سەدەکانی ڕابردوون... ئێستا ئەگەر کچ و کوڕە لاوەکان دەیانەوێ مەدەنی‌و شارستانی‌و مۆدێرن بن پێویستە لەسەریان ئەم چەمك و بابەتانە ببەزێنن..

بەپلانێك هەوەس‌و ئارەزووی ئەو لاوانە دەوروژێنن‌و دەیانکەنە قوربانی گەمەو پلانێکی چەپەڵ.. شەوو ڕۆژ هەر لێیان دووبارە دەکردنەوە: ئەم پەردەیە بدڕێنە.. ئەم پەرژینە بشکێنە...ئەم کۆسپانە لابەو کۆتو داوەکان بپسێنە...سەرپۆش فڕێ دە چ وادەی شەرمە...)

ئەو لایەنانەیش کە دەیانەوێ ڕاوی بکەن‌و بیکەنە نێچیری ئارەزووەکانیان ڕەگو ڕیشەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ دەرەوەی وڵات، ئەوانە پێیان دەڵێن: گوێی مەدەری.. فەرامۆشی کە، لەپێی کە... مێشکت خەریك مەکە بە ڕابردوو یان داهاتووەوە.. لەژیانی ئێستادا بژی و ڕابوێرە و لەکیس خۆتی مەدە..)

ئەم دیدە گێڕو گەوجە بۆ ژیان هیچ ژیریەکی ساغ و ویژدانێکی وریاو زیندوو قبوڵی ناکات... کەچی بەداخەوە لەو ناوەندانەدا تەشەنەی کردووە کە ویستویانە خۆیان چەواشەبکەن و بەو خەڵەتاندنەیش ڕازی و مەمنونن. ئادەی سەری لەکوێوە دەرچوو؟ لە ئەنجامی ئەمەدا نەوەیەك سەری هەڵدا کە لەبیرکردنەوەو تێڕامان

خـــۆی لا دەداو ســـڵ دەکاتـــەوە و خـــۆی دەدزێتـــەوە.. ئاســـان دەخەڵەتێ، هەڵپەی ئەوەیەتی هەموو شتێکی لەبیر بچێتەوەو کەڕ و کاس بێ.. شەیدای بێ ئاگایی و خۆدامالینە، خۆ دەگلێنێتە ژیانێکی بەرەڵلایی و ڕابواردن و مەستی و خوماریەوە..

لێرەدا خۆم پـێ نـاگیرێو ناچـارم کـە دیـد و بۆچـوونێکی قـووڵی یـــەکێ لـــە بیرمەنـــدەکان بهێـــنم کـــە دەڵـــێ: لەســـەردەمی (ڕێکخســتنەکاندا)[1] ئــەورووپاش بــەدوای هــەمان ئومێــدەوە خــۆی دەکوتــاو دەڕۆشــت، کــەبریتی بــوو لەکوشــتن و نەهێشــتنی هــەموو پیرۆزیەکان لەناو ویژدانی توێژی ڕۆشنبیری تورکیادا...واتە کوشتنی ئیســـلامەکەی... ئـــەورووپایش ئـــەو هێـــزو توانایـــەی نـــەبوو کـــە پیرۆزیـەکانو ئاینەکـەی خـۆی لـەناو ئـەو دەروونانـەدا بنیـاد بنـێ... چـونکە ئامـانج و نیـازی مـژدەدەر و بـانگخوازە مەسـیحیەکان ئـەوە نەبوو کە دەوڵەتی عوسمانی بکەنە مەسیحی، بەڵکو نیـاز و ئاواتیـان ئەوە بوو کەئەم دوژمنە دێرینەیان نغرۆ بکـەن و بیکەنـە کۆمایـەکی تـــەپوتۆزی (نەتـــەوەو ڕەگـــەز و میللەتـــەکان ).. واتـــە کۆمایـــەکی تەپوتۆز کە هـیچ ویسـت و هەسـت و نەسـتی نـەبێ... کۆمایـەك کـە

---

[1]- سەردەمی ڕێکخستنەکان: ماوەی تازەگەری و لاسایی‌کردنەوەی ڕۆژئاوابوو، کە بە فەرمانی سوڵتان دەستی پێکرد لە ٣ی تشرینی یەکەمی ١٩٨٩ی زاینیدا تـا ڕووخـانی دەوڵەتی عوسمانی بەردەوام بوو.

چۆنت بویَ و به چ قالّبێك بتەویَ ئاوا دایرێژیتەوە و تەواو دەستەمۆ بیَ..)

بەلاّم باشە چۆن لاوان ڕاپێچی ئەم جۆرە چارەنووسانە کران؟ ئەم باس و خواسە کەرەستەی باس و لێکۆڵینەوەیەکی تێرو تەسەلە و نە بە یەك پەڕاو و نە بە چەندین پەڕاو پەی بەهەموو لایەنەکانی ئەو بابەتە نابرێت و مافی خۆی پیَ نادریَ، بەلاّم دەتوانم زۆر بەکورتی بلّێم:

ئەگەر توێژینەوەی هەموو دام و دەزگاکانی بلاّوکردنەوە و میدیاکان بکرێت هەر لە (ڕۆژنامەو گۆڤار و چیرۆك و ڕۆمان)ەوە تا دەگاتە سینەماو تەلەفزیۆن و ڕادیۆو ئینتەرنێت و هۆکاری زەمەنیش ڕەچاوبکرێت، دەبینین کە زۆرێك لە دەرد و پەتا کۆمەلاّیەتیەکان ئاوا وەك پەتای کۆلێرا کتوپڕ و بیَ پێشەکی و پەروا سەریان هەلّنەدەدا و تەشەنەیان نەدەکرد، بەلّکو ئەنجام و ئاکامی جێبەجێکردنی نەخشەو پلانێکی تۆکمەو بۆ دارێژراو بووە بە بایەخ و چاودێریەکی تەواوەوە.

ئەورووپایەك کە دوێنیَ لێمان دەلەرزی، ئەمڕۆ لەدەستی دیَ کچەکانمان ڕاکێشێت بۆلای خۆی و بەناوی پێشبڕکێی (شاجوان)ەوە بیَ شەرمانە تاقیمان بکاتەوەو ئێمەش موویەکی عیززەتمان نەبزویَ و بیَ باك بین... ئەورووپایەك کە ئەوەی لەدەست بێت، کەواتە هەرگیز بە ڕێکەوت و کتوپڕ نەبووە، ئەو توێژینەوەیەش دەتوانیَ کە

زۆر بەڕوون و ئاشکرایی پەردە لەسەر ئەمە هەڵبداو ڕوون و ئاشکرای بکات...

ئەم توێژینەوەیە پێویستە تەنانەت بەدوای بنج و بنەوانی ئاوازو هۆنراوەی گۆرانیەکانی ئێستاماندا بچێت و دەری بخات کە تا چ ڕادەیەك پەیوەندییان بە کەلتورو ڕۆشنبیری ڕەسەنی خۆمانەوە هەیە.

باڵەم بارەیەوە یەك نموونەت بۆ بهێنمەوە.

ئەو لاوەی کە لە ناو تاکسی یان ڕادیۆی ماڵەکەیان یان تەلەفزیۆنەکەیانەوە گوێ لەو گۆرانیانە دەگرێ کە هۆنراوەکانی باسی دڵدارینو ڕابواردن بە چارەنووسی ئافرەت دەکەن[1] ، وەك ئەو گۆرانیەی کە دەڵێ" لە کۆتاییدا هەر بۆ من دەبێ" یان ئەو گۆرانیەی کە دەڵێ " ڕۆژێك دەبێ کە دێیتەوە بۆلام".

---

١- بەتایبەت ئەو کلیپانەی کە بەناوی گۆرانیەوە یاری کچ و کورو دڵداری و دیمەنی نارەزوو بزوێن و بێ شەرمی و دەستاودەست کردنی کچ بەدەست کورانەوە و چەندەها دیمەنی تر کە بەردەوام شاشەی تەلەفزیۆنەکانیان داگیرکردوەو بەناوی هونەرەوە، هونەرو کولتوری میللەتیان شێواندووە و کردویانەتە پاشکۆ و نوسخەیەکی هونەری زیانبەخشی بێگانەو بۆ ئەم مەبەستەش بەشێکی زۆری سەروەتو سامانی وڵاتی بۆ تەرخان دەکرێو چەندین کەناڵی لۆکاڵیو ئاسمانیی خراونەتە کار و هیچ بەرنامەو پرۆگرامێکی سوود بەخشیان تێدا نیە جگە لە گۆرانیو سەمای بێ ناوەڕۆکو زیانبەخش. بێگومان پسپۆڕانی بواری هونەری ڕەسەنو پسپۆڕانی کۆمەڵناسیی دڵسۆز لەهەموو کەس زیاتر بەم قەیرانو ئاڵۆزیە نیگەرانو هەستیارن.

ئەولاوە بێ ئـەوەی هەسـت بـەخۆی بکـات و بـەخۆی بزانـێ وردە وردە مێشکی کاس و بـێ هـۆش دەکرێـت و، مێشـکی دەشـۆرێتەوە، ئەگەر لەلایەنی عەقڵیشـەوە نـەبێت لـەڕووی هەسـت و نەسـتەکانەوە ناچار دەبێت قبوڵی ئەوە بکات ئەو کچەی بۆ هاوسەری خـۆی هـەڵی بژاردووە لەگەڵ پیاوانی تریشدا دەستی ناپـاکی تێکـەڵ بکـات، ئـەو تەنیا ئەوەی بەلاوە گرنگە لە ئاخردا بگەڕێتەوە بۆلای خـۆی و پـاش ئەنجامدانی ئەو هەموو گونـاح و بەدکاریـەی کـە لەگـەڵ لاوانـی تـردا کردوویەتی لە ئاخری ئـاخردا هـەر بگەڕێتـەوە بـۆلای خـۆی و خـۆی واتەنی (دایکی حەوت کوڕ بی هەر بەتەماتم.) ئەم قبـوڵ کـردن و بـۆ چوونە بێ هەست کردن لەناویدا دەڕوێنرێت.

ئـەم چـەمك و ڕوانینـە بـۆ کچـێکی لاو لەوانەیـە ترسـناك تـر بێـت ئەگـەر گۆرانیـەکانی تـریش بـەراورد بکـەیت یەکسـەر هەسـت بـەوە دەکەیت..

مادام باس هاتە سەر ئەم باسـە ناچـارین دەبـێ باسـی (ڕۆمـان و چیرۆکە دڵداریەکان)یش بکەین. هەر ڕۆمانێـك لەڕێگـەی کەسـایەتیو پاڵەوانەکانی رۆمانەکەوە دیـدو فەلسـەفە و بۆچـوونی نووسـەرەکەی نمایش دەکات بۆ ژیان...

بۆیـە ئەگـەر هـەر ڕۆمـان نوسـێك بەچـاکی ناناسـیت و هـیچ زانیارییەکت لەبارەیەوە نییە کـە دیـدو ئایـدیاو بیروبۆچـوونی چۆنە سەبارەت بەشەرەفو پاکداوێنیو ژیانی خێـزان، ئـەوا خوێندنـەوەی

ڕۆمانەکانی مەترسیەکی زۆری هەیە بۆت، وەك مەترسی ڕۆشتنی کچێك بۆ ناو دارستانێك لەگەڵ کوڕێکی نەدیەو نەناسدا... ئەو ڕۆماننوسە کە بەتەنها لەگەڵ تۆدا دەدوێ دەتوانێ هەموو هزرو بیرەکانی خۆی بڕشێنێتەوە ناو مێشکی تۆ، ئەوەش بەنهێنیی و ئاسپایی و لە پشت ڕووداوەکانی ناو ڕۆمانەوە ئەنجامی دەدات. چونکە پاڵەوانەکانی ڕۆمانەکە تەنیا ( مایکرۆفۆن )ێکن، قسەکەری سەرەکی خودی ڕۆماننوسەکەیە.

پەندێك دەڵێت (لە هەموو گفتوگۆیەکدا ڕەنگ گرتن هەیە) ئەمە شتێکی ڕاستە.. ئەو لاوەی کە زۆر لەو ڕۆمانانە بخوێنێتەوە، بێ ئەوەی هەست بەخۆی بکات وای لێ دێت کە لەچاویلکەی دیدو بۆچوون و فەلسەفەی ئەو نووسەر و ڕۆماننوسانەوە تەماشای ژیان و مرۆڤ و بوونەوەر دەکات. چەندەها بیرو هزری قێزەون و ژەهراوی هەن شایستەی نەفرەت و فڕێ دانن، کەچی لەڕێگەی قارەمانەکانی ئەو ڕۆمانانەوە دزە دەکەنە ناو بیروباوەڕی لاوەکانەوە.

لەمرۆشدا گۆڤار و پەڕاوە بەرەڵڵا و سۆزانیەکان لەڕۆمانەکان مەترسیان زیاترەو زۆر بەئاشکراو بەڕۆژی ڕووناك هەرچی چەپەڵی و داوێن پیسی هەیە دەیپژێنن بەناو خەڵکدا، بەڵام واخەریکە کۆتایی ئەم هەرەس و داڕمانە لەئاسۆوە دەردەکەوێت، چونکە ئەو بڵاوکراوە سێکسی و بەرەڵڵایانە خەریکە دەبنە مەترسیەکی ئاشکراو

چیتر پێویستە ڕەواجیان پێ نەدرێت‌و دەبێ هەمووان بەگیانی لێپرسراویەتیەوە بەڕوویاندا بوەستینەوە.

خۆرئاوایش لای کردوەتەوە بەلای ئەم مەترسیەداو ئێستاکە خەریکە بەدوای چەندین ڕێگەو شێوازدا دەگەڕێ بۆ ڕزگار کردنی لاوەکانی کە زۆر بەخێرایی بەرەو دۆزەخ و کەندەلانی لێك هەڵوەشان و ئالودەبوون لەسەر مادە هۆشبەرەکان تلۆر دەبنەوە... واتە واخەریکە ئەوەی دەرخواردی ئێمەیاندا، خۆیشیان تالاوەکەی دەچێژن، ئەو ژەهرانەی کە بۆ ئێمەیان تێچاندبوو خەریکە خۆیان یەقی دەکەنەوە. ئەم ئامارەی خوارەوە کە لەپەڕاوێکدا خوێندمەوە ڕوونی دەکاتەوە کە بارودۆخی خۆرئاوا لەچ مەترسی و هەڕەشەیەکدایە:

(ئامارێك بۆ ژنان کراوەو ئەنجامەکەی دەری خستووە کە لە چوار ویلایەتی ئەمریکادا لەسەدا چل وسێ ی ژنانی ئەمریکا خیانەت لەمێردەکانیان دەکەن ) کە ئەمریکا وا بێت، دەبێ فەڕەنساو سوێد حاڵیان چۆن بێ؟ هەندێ لەو ناوەندانەی کە بە هەڵە لە بزوتنەوەی (بەخۆرئاوابوون) تێگەیشتوون و بەمەبەستیشەوە واتێگەیشتوون.. گەورەترین ئاواتیان ئەوەیە کە بەچاوی خۆیان ببینن وڵاتی خۆیشمان هەمان ئاماری تێدا ڕووبدات. بەڵام سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵ‌و تەقەلاو پڕوپاگەندانەیان‌و ئەو سامانەی کە دەیخەنە گەڕ بۆ

ئەو مەبەستە، کەچی سوپاس بۆ خودا نەیانتوانیوە بەو ڕادەیە کۆمەڵگاکەمان گرفتاری ئەو دارمان و داڕزانە بکەن.

ئاشکرایە کە کۆمەڵگاکەمان دووچاری چەندین برینی گەورەو قووڵ بووە.. بەڵام سارێژ و تیماری ئەو برینانە لەدەستی کەسانی وەك ئێوەدایە کە خاوەنی ئایین و ڕەوشت و جوامێری و غیرەتن و بەستراوە بەرەنج و خەباتی ئێوەوە..

هیوادارم لەو مەیدانەدا سوارچاکێکی چاپووك و سەرکەوتوو بیت.....والسلام

لەیلا لە نامەیەکی ئەم دواییەیدا دەیوت:

" دەزانم زیاد لەپێویست سەرقاڵم کردووی، هەموو جارێکیش بەخۆم دەڵێم: ئەمە دوایین پرسیارم دەبێت، ئیتر دوای ئەمە پرسیاری تر ناکەم. بەم جۆرە بڕیاری خۆیشم دەدەم، بەڵام هەرئەوەندەی پێ ناچێ و گرفتێکم تووش دەبێت و ناچارم دەکات جارێکی تریش نامەت بۆ بنووسم...

وەك دەزانن لەنامەی یەکەممدا پرسی بابەتی یەکسانبوونی ژن وپیاوم کردبوو، لەم ماوەیەی پێشوودا بڕیارم دابوو کەئەو بابەتە بخەمەلاوە. بەڵام پێش چەند ڕۆژێك لەناو پۆلی وانە وتنەوەدا و لەکاتی پشوو و چا خواردنەوەیشدا مشتومڕێك هاتە ئاراوە... بابەتی مشتومڕەکەیش ئەمە بوو: ئایا دەکرێ باس لەیەکسانی نێوان پیاو و

ژن بکرێت؟ منیش جارجار لەو گفتوگۆیەدا بەشداریم دەکرد. جانازانم ئایا دەتوانن لەم بەرەیەوە شتێکم بۆ بنووسن؟

منیش ئەم نامەیەی خوارەوەم بۆ نووسی:

– بۆ لەیلای عەودالّی حەقیقەت..

ئەم پرسیارەت پێش چەند مانگێك کردبوو، هێشتا لەبیرم نەچۆتەوە...بەڵام بوونی هەندێ بابەتی گرنگتر وەڵامی ئەمیان دواخست... کەواتە ئێستا کاتی وەڵام دانەوەی هاتووە.

با پێش هەموو شتێك پێت بڵێم کە زۆر زەحمەتە وەڵامی ئەم پرسیارە بە ( بەڵێ ) یان ( نەخێر ) بدەمەوە. چونکە ئەو پرسیارە بەو دارشتنەی تەواو روون نییە. بۆیە پێویستە بە پرسیارێکی تر رۆشن بکرێتەوە: لەکوێ؟ لەچ بابەتێکدا؟ لەچ لایەنێکەوە؟

جا ئەگەر پرسیارەکە لەلایەنی مافەکانەوە بێت دیارە وەڵام (بەڵێ)یە.

بەڵام ئەگەر پرسیارەکە لەبارەی هەموو لایەنەکانەوە بێت ئەوا هەرگیز پێویست بە وەڵامدانەوە ناکات، چونکە وەڵامەکە لەناو دەقی پرسیارەکەدا هەیە. مادەم ئێمە باس لە دوو رەگەزی جیاواز دەکەین، کەواتە چۆن دەبێ بیر لە یەکسانی رەهای نێوان دوو رەگەزی جیاواز بکرێتەوە؟

بۆ نموونە: دەتوانین دوو سێو بهێنین کە هەمان رەنگ و هەمان قەبارە و وەك یەك زەرد و گەییوو بن و بیانخەینە پاڵ یەك و

بپرسین: ئایا یەکسانن؟ بەڵام بەھەمان لۆژیکەوە ناتوانین بپرسین: ئاخۆ ژن یەکسانە بە پیاو؟ چونکە وێڕای ئەوەی لەچەند بوارێکدا یەکسانن، بەڵام بواری وا ھەیە کە پیاو تیایدا زۆر زاڵ و لە پێشترە لە ژن، ھەروەھا چەند بوارێکیش ھەن کە تیایاندا پیاو زۆر لەدوای ژنەوەیە. بۆیە ناکرێ بەیەك وشە ئەو بابەتە یەکلا بکرێتەوە.

ئەگەر پرسیارەکەت ئەمەیە: ئایا ژن و پیاو لە مافەکانی دەسەڵاتی بەڕێوەبردنی ماڵ و خێزاندا وەکو یەکن؟ ئەوا لە کۆتایی نامەکەمدا وەڵامی دەدەمەوە.

خۆ ئەگەر پرسیارەکە لەبارەی یەکسان بوونی ژن و مێردە لە ڕووی مرۆڤایەتیەوە، واتە ئایا ھیچ جیاوازیەك لە نێوانیاندا ھەیە لەو ڕووەوە کە مرۆڤێکی باش بن یان مرۆڤێکی سەرکەوتوو؟ ئەم پرسیارەش پێویستی بە ڕوونکردنەوەیە.

دەسەڵات شتێکەو چالاکی و باشی شتێکی ترە.. دیارە ئەوەندە ئاسان نییە کە بە سەرپێیی و کەفوکوڵ باسی ئەوە بکەین کە کامەیان باشتر و چاکترە: ژن یا پیاو، چونکە مرۆڤ..ژن بێت یان پیاو، بەندەی خودایە. جا ئەگەر خودا یەکێ لەبەندەکانی خۆش بوێ و زیاتر لێی ڕازی بێ دیارە ئەو بەندەیە لەلای خودا بەندەیەکی بەڕێز و شکۆدارە. لە قورئانی پیرۆزیشدا – کە فەرمایشتی پەروەردگاری جیھانیانە – پێوەر و تەرازوو بریتیە لە تەرازووی

پارێزکاری (تەقوا) نەك (ڕەگەز)، تەقوا پێوەری باشی و شانازییە..
بەڵام ئاخۆ تەقوا چییە؟

بەکورتی: تەقوا ئەوەیە کە مرۆڤ لە خودا بترسێت و خۆی لە گوناح لابدات، واتە دوورەپەرێز بێت لەهەر ڕەفتار یان گفتار یان هەڵسوکەوتێك کە خودا لێی ڕازی نەبێت. ئەوەش بزانێت کە گەورەترین و پیرۆزترین ئامانج ئەوەیە کە مرۆڤ بگات بە ڕەزامەندی خودا، خراپترین و گەورەترین دۆڕاندنیش ئەوەیە کە ئەو ئامانجە بدۆڕێنێ. جا هەر کەسێ لەوەدا سەرکەوتوو بوو ئەوە مرۆڤی بەرز و سەرکەوتوو چاك و بەڕێزە، لێرەدایە کە هیچ نرخ و بەهایەك بۆ ڕەگەز دانانرێت.

هەرکاتێ ناوی ( تەقوا) هێنرا، یەکسەر ( کرداری چاك )یش بەخەیاڵدا دێت، کرداری چاك بریتی یە لە کاروفرمانی باش و ڕەفتاری جوان...لێرەیشدا دیسان ڕەچاوی ڕەگەز ناکرێت. بۆ نموونە کە پاداشتی خوێندنەوەی یەك پیتی قورئان بە(دە) چاکە بێت دیارە ئەوە هەموو خەڵك دەگرێتەوەو، ناوترێ لەم پاداشتەدا بەشی ئافرەت کەمترە یان پاداشتی پیاو زیاترە... هەرگیز ئەمە لە ئارادا نییە...

دەتوانین پرسیارەکە لەڕووی دەروونیەوە باس بکەین و بپرسین: ئایا لەڕووی دەروونی و سایکۆلۆژیەوە هیچ جیاوازی لە نێوان ژن و پیاودا هەیە؟ بێ هیچ دوو دڵی و سڵ کردنەوەیەك وەڵام دەدەینەوە: بێ گومان.

ئێستاش هەوڵ دەدەم بە کورتی جیاوازیە دەروونیەکانت بۆ باس بکەم. هەر لە ئێستەشەوە حەز ئەکەم ئەوە بڵێم کە ئەوەی دەینووسم نە بیروڕای خۆمو نە قەناعەتی خودی خۆمە، بەڵکو کورتە و پوختەی ڕاو تێڕوانینی زانایانی پسپۆڕی ئەو بابەتەو بیریار و زاناکانە.

هەر لەتەمەنی منداڵیەوە جیاوازیە دەروونیەکانی نێوان ژنو پیاو دەست بە دەرکەوتن دەکەن...بووکە شووشەو یاری منداڵە کچەکان بۆ خۆی جیاوازە لە جۆری یاریو هاروهاجی منداڵە کوڕەکان. باشترین یاریەك لەلای کچۆڵەیەك بریتی یە لە (بووکە شووشە)، بەمەرجێ لەو تەمەنەدا هیچ بیرو خەیاڵیشی بەلای شووکردنو هاوسەرگیریەوە نییە. ئەو کچە بووکە شووشەکەی دەخاتە باوەشی خۆیو بەخۆیەوە دەیگوشێو جلەکانی دەگۆڕێو پاشان دەیخاتە بێشکەو جۆلانەوەو ڕای دەژەنی تاکو بنوێ، زۆربەی کاتی خۆیشی لەگەڵ ئەو بوکەڵەیەدا بەسەر دەبات...بەڵام منداڵی کوڕ پێی خۆشترە یاری بە ئۆتۆمبێل و فڕۆکەو چەك و دەمانچە بکات...

وردە وردە منداڵان گەورە دەبنو دەستە هاوڕێیان پێکەوە دەکەونە قسە کردن، لێرەشدا بابەتەکانیان جیاوازن...کاتێ پیاوان پێکەوە دادەنیشن و دەکەونە گفتوگۆ زیاتر حەزیان لەو بابەتانەیە کەباسی ئیش و کارو باسی سیاسەت دەکەن، کەچی سەری زمان و بنی زمانی ژنان باسی ماڵ و منداڵ و کەلوپەل و دورمان و جل و بەرگ و ئەوانەیە..

لەڕووی توانایشەوە جیاوازیـەکی دیـار لـەنێوان هـەردوو ڕەگـەزدا هەیە، ئەوەتا پیـاو لـە ڕووی لێکدانـەوەو پێکهاتـەی بـیرەوە توانـای باشـترە، بـەڵام ژن لـە چـاولێکەری و لاسـایی و هێـزی دەرخ و لەبەرکردندا توانـای زیـاترە... ئەگـەر پێویـست دەکـات بەنمونەیـەك ڕوونـتری دەکەمـەوە: پیـاو دەتوانـێ نەخشـەی تـەلارێکی نـاوازە دابڕێـژێت و هـەموو بـەش و بڕگـەو شـوێنەکان زۆر بـە ڕێـكوپێکیو جـوانی لـە جێگـەی شیاوی خۆیانـدا دابـەش بکـات، لەوەشـدا لـەژن سەرکەوتوو تر دەبێت.. بـەڵام ژن لـەپیاو باشـتر دەتـوانێ نـەخش و نیگاری سەردەرگاو دیوارەکان دروست بکات و بیڕازێنێتەوە.

پیاو زیاتر کراوەیە بە ڕووی دنیای دەرەوەدا، بـەڵام ژن لەلایـەنی سۆز و بەزەیی‌و میهرەوە پێش پیاو دەکەوێ... لە ململانی و کێشەو کارکردنـدا پیـاو توانـای زیـاترە.. بـەڵام ژن لـەپیاو زیـاتر ڕووی لـە ناوخۆی ژیان زیـاترە.... گـەورەترین سـوودی ئـەم ڕوونکردنـەوەش ئەوەیە کە بایـەخ و گرنگـی بـە منداڵـەکانی نـاو خانـەو لانـەی خـۆی دەدات.

تەنانـەت لەلایەنـە لاوازەکانیشـدا جیـاوازی لـەنێوان پیـاو و ژنـدا هەیە، ئەوەتا پیاو گرفتاری دەردی خۆسەپاندنە و حەز بە دەسەڵات و هـەژموون دەکـات، بـەڵام دەبیـنین ژن دووچـاری حـەزی خـۆ دەرخسـتن و خـۆ نوانـدن و ڕاکێشـانی سـەرنجەکان و وروژانـدنی سەرسامی خەڵك بووە.

ئاشكراترین سیفەتی ژن یان توانای كاریگەری ژن لەوەدایە كە زۆر هەستیارە، چونكە ئامادەیی بەهێزترە بۆ مانەوە لە ژێر كاریگەری ژینگەو سنووری دەوروبەری خۆی. بۆیە ژن ئاسانتر دەخەڵەتێ و زوو فریو دەدرێو زۆر خێرا بەقسەی لوس و ماستاو لەخۆی دەگۆڕێ و دەخەڵەتێ.

"حەدەس"[1] و زوو هەستكردنی ژن بەهێزترە لەپیاو. ژن لەپیاو زیاتر حەز و تامەزرۆی هەیە بۆ گۆڕانكاری و نوێ بوونەوە...

لەبەر ئەوەیشە كە ژن هێزی لە پیاو كەمترەو قەبارەیشی لەو بچوكترە، دەبینی ژن زیاترو بەهێزتر پێویستی بە پەنابردنو هانابردن هەیە.

بەڵام ئەم پێداویستیە سروشتیە لە هەندێكیاندا دەبێت بەگرێی خۆ بەكەم زانین، ئەم گرێیەش زیاتر لەشێوە و بیچمی گرێی خۆ بەپیاو كردن دەردەكەوێ.

ژن زیاتر پەیوەستە بە هاوبەشی ژیانیەوە و لە پیاویش بەئەمەك و وەفادارترە.

بەڵام لە خۆشویستنی دنیاو ئارەزووەكاندا ژن پێش پیاو دەكەوێ، ژن زیاتر ئامادەیە كە ببێت بەئامرازێك بەدەست شەیتانەوە.

---

١- حەدەس: زاراوەیەكی (مەنتیق)ی یە بە واتای زوو تێگەیشتن لە شتێك بەبێ بیر لێكردنەوە.

لەیلا خان! ئەمە ئەو چوارچێوە دەروونیەیە کەژن تیایدا دەژی..
بۆیە پێویستە ئێمە هەوڵ بدەین ناچاری نەکەین خۆی وەك پیاو بنوێنی، بەڵکو هانی بدەین تابێتە ژنێکی نموونەیی.

ئەگەر چاوێك بەدەوری خۆماندا بگێڕین دەبینین کە گونجان و تەباییەکی تەواو ئاشکرا لەنێوان جەستەی گیانداران و ڕۆحیاندا هەیە، هەموو ڕۆحێك لە جەستەی خۆیدا ئاسوودەیە، ئەگەر ڕۆحی ئاسکێك بخەینە جەستەی شێرێکەوەو زۆری لێ بکەین کە وەك شێر ڕەفتار بکات ئەوا ئێمە بەوە یەکەم کەس دەبین خراپە بەرامبەر بەو ڕۆحە ناسکەی ئاسك دەکەین...لەگەڵ هەموو نەڕەیەکدا ئەو ڕۆحە بەشێك لەناسکی و نەزاکەتی خۆی لەدەست دەدا. لەگەڵ هەر پەلامارێکدا بەشێك لە جوانی و لەنجەی ڕەسەنی خۆی دەدۆڕێنێ.

تا ڕادەیەك ئەوە بەسەر ژن و پیاویشدا دەچەسپێ، جیاوازییە ئاشکراکانی نێوان جەستەی ئەو دوو ڕەگەزە لە پێکهاتەی دەروونیو ڕۆحیی هەریەکەیاندا دەردەکەوێت و دەنگ دەداتەوە.

فەرامۆش کردنی ئەم کارەو ناچارکردنی ئافرەت تاکو بەناوی یەکسانی ژن و مێردەوە وەك پیاوان ڕەفتار و هەڵسوکەوت بکات، هەڵەیەکی گەورەو زیانێکی قورس وگران دەبێت، ژنیش یەکەمین زیانی بەردەکەوێ و باجی گەورە ئەو دەیدات.

خۆ لە ڕاستیدا هەموو ئەو هەوڵو رەنجە چڕو پڕانەی کە بەنیازی خراپ و چەپەڵەوە لەم پێناوەدا دران، نەیانتوانی هیچ شتێك بگۆڕن،

بەگوێرەی ئـەو یاسـایەش کـە دەڵـێ: (حـوکم و بڕیـار بـۆ زۆرینەیـە) دەتوانین بڵێین: ژن هێشتا فەرمانبەرە زیاتر لەوەی بەڕێوەبەر بێـت، نووسەرە زیاتر لەوەی قـازی و دادوەربێـت، سـکرتێرە زیـاتر لـەوەی فەرماندە بێت، خانەخوێی ناو فڕۆکەیە زیاتر لەوەی فڕۆکەوان بێـت، فرۆشیاری ناو گەنجینەو کۆگاکانە زیاتر لەوەی کە خـاوەن گەنجینـە بێت... چونکە مەحاڵە کە سروشت و ماکی مرۆڤ بگۆڕدرێت.

بـەڵێ لەیـــــــلا!...ئێمـە تـا ئێسـتا نـەمانتوانیوە کـە جێگـەو پێگـەی شایسـتە بـەخۆی بـدەین بـە ژن... بـەو چـاوەوە تەماشـای دەکەین کە لاوازە، هەروەك ئەمەش یەکێ بێ لە هەڵە و گوناهەکانی، بەوە ئێمەش ستەممان لێکرد، هەروەك ڕۆزی و ژیانی ئەو بە ئێمەوە بەسترابێت، مامەڵەیەکی خراپ و ستەمکارانەمان لە گەڵیـدا کـردووە، یاخود ڕێگەو بوار و هانمان داوە تا خۆی وەك پیاو لێ بکات، بەوەش ژیانی ئەومان شێواندووە و گەورەترین خراپەمان لەگەڵیدا کـردووە.. ئێستاش پێم خۆشە کە کەمێك لەبارەی بـەڕێوەبردن و سـەرۆکایەتی خێزانەوە بدوێم:

خوای گەورە کە بەدیهێنەر و خاوەنو موڵکداری هەردوو ڕەگـەزی مرۆڤە، دەفەرمووێ: ﴿ الرِّجَالُ قَوَامُـونَ عَلَـى النِّسَـاءِ بِمَـا فَضَّـلَ اللّـهُ بَعْضَـهُمْ عَلَـى بَعْـضٍ وبِمَـا أنفَقُـوا مِـنْ أمْـوالِهِمْ فَالصَّـالِحَاتُ قَانِتَـاتٌ حَافِظَـاتٌ لِلْغَيْـبِ بِمَـا حَفِـظَ اللّـهُ واللاَّتِـي تَخَـافُونَ نُشُـوزَهُنَّ فَعِظُـوهُنَّ

وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلاً إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيّاً كَبِيراً﴾ النساء:٣٤ .

واتە: ( پیاوان بەڕێوەبەرو سەرپەرشتیکەری ئافرەتانن، خوا فەزڵی پیاوانی بەهێزو تواناو گورجوگۆڵی داوە بەسەر ژناندا). ئەوەتا پیاوان ئەتوانن کاری گران بکەنو غەزا بکەنو سنوور بپارێزن. بێجگە لەوەش ژنان لەکاتی حەمل و شیرداندا ئیشیان پێ ناکرێ، لەکاتی عادەو ماوەی حەیزدا بۆ هاتنە ناو کۆمەڵ ناشێن. هەروەها بەراورد کراوە ژنان دڵیان لە پیاوان ناسکترەو سەبریان لەسەر زەحمەت کەمترە. هەروەها پیاوان ماڵی خۆیان خەرج دەکەن بۆ ژنەکانیان چ بۆ مارەییو چ بۆ بژێوی، جا مادام ژن لە ئیدارەی پیاودا بێتو کاروباری ناوماڵی بۆ ڕابگرێ، پێویستە پیاویش خەرجیو نەفەقەی ناو ماڵ بگرێتە ئەستۆ، جا ئەو ژنانە کە صالحو خواناسنو لەسەر ماڵو ناموسی خۆیانو مێردەکانیان ئەمیننو بەیارمەتی خودا پارێزگاری لە وەزعی خۆیانو مێردەکەیان دەکەن، ئەو ژنانەیش کە ئەیانبینن لە ڕێگا لا ئەدەن ئامۆژگاریان بکەن، ئەگەر تەمێ کردنو ئامۆژگاری سوودی نەبوو ئەوا لە جێگە نووستندا لەگەڵیان مەبن، واتە لەگەڵیان مەخەون. ئەگەر ئەوەیش سوودی نەبوو ئەوا دەکرێ لێیان بدەن لێدانێکی بێ زیان. جا ئەگەر گوێڕایەڵ بوونو هاتنە سەر باری خۆشیو پێکەوەژیانی بە ئاسوودەیی، ئیتر ڕێیان لێ مەگرنو بەهانەیان پێ مەگرنو

سەرزەنشتیان مەکەن، وا دابنێن هیچ لە بەینتاندا ڕووی نەداوە. خودا بەرزەو پایەی بالایەو لە ئێوە بە دەسەڵاتترەو گەورەیە، کەواتە خۆتان لە گوناە بپارێزن.

بالێرەدا ڕاڤە و تەفسیرێکی خەست و خۆڵی ئەم ئایەتەت بۆ بکەم.

پیاوان دەسەڵاتیان بەسەر ژناندا هەیە، واتە سەرۆکایەتی ماڵ بۆ پیاوە. واتە ئەرکی پاراستنی ئەندامانی خێزان دەکەوێتە ئەستۆی پیاوەوە. لێرەدا تێدەگەین کە پیاو لە ژن گونجاو ترو لەبارترە بۆ سەرکردایەتی و فەرمانڕەوایی، بەڵام ئایەتەکە بەڕوون و ئاشکرایی نالێ: پیاوان لەژنان بەرزترو باشترن، بەڵکو دەفەرموێ: ﴿ بِمَا فَضَّلَ اللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ ﴾ دیارە ئەم ئایەتە چەند مانایەکی تریشی هەیە. ئەم گوزارش و بڕگەیە وا دەردەخات کە چەند لایەنێك هەن و تیایاندا پیاو لە ژن لەپێشترە، دەی چەند لایەنێکی تریش هەن ژن تیایاندا لە پیاو لە پێشترە. لەژێر چەتری ماڵیشدا چاکەو ئاکارەکانی هەردوکیان یەکانگیر دەبن بۆ دەستەبەرکردنی پێداویستیەکان و بەختەوەری خێزان.

هەروەها لە ئایەتەکەوە لەوەش تێدەگەین کە راست نیە هەموو پیاوێك لە هەموو ژنێك گونجاوتر و لەبارتر بێت. چونکە هەندێ ئافرەتیش هەن کە تواناو لێهاتوویەکی تایبەت و جیایان هەیە. هەروەها هەندێ پیاویش هەن ئەوەندە سیفەتی پیاوەتیان تێدا

کەمە، هەرگیز ناگەن بە شان و پایەی زۆرێك لە ژنەکان دا، خۆ ئەمەش ڕاستیەکی لەبەرچاوە.

لەگەڵ ئەمانەشدا بەپێی ئەوەی کە ماڵو خێزان بچوکترین پیکهاتەی کۆمەڵگایە، هەردەبێ بەڕێوەبەر و فەرمانڕەوایەکی هەبێ. لە هەموو هەل و مەرجەکانیشدا هەر پیاو ئەو فەرمانڕەوایەیە، ئێمە هەر ئەوەندە لە ئایەتەکە تێدەگەین.

ئایەتەکە سەبارەت بە پیاو دەفەرموێ (بِمَا أَنفَقُوا مِنْ أَمْوالِهِمْ) واتە: ئەرکی سەرشانی پیاوە کە خەرجی ژن ومنداڵەکانی بکێشێ. هەروەها ئایەتەکە ئامارە بۆ ژنی باش دەکات (فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ...) کەواتە پیاو کاربەدەستی ماڵەوەیە و ژنیش ئەگەر دەیەوێ هاوسەرێکی چاك بێت پێویستە گوێڕایەڵی شوەکەی بێت.

هەر سەبارەت بە بابەتی (فەرمانڕەوایی) واباشە ئامارە بەوەش بدەین کە چەند کارو فەرمانێکی وەك ( پێغەمبەرایەتی و پێشەوایەتی) هەن و تایبەت کراون بە پیاوانەوە. بەڵام دیسان ئەوە ناگەیەنێت هەموو پیاوێك باشتر بێت لە هەموو ژنێك، هەر بەو جۆرەی ئایەتە پیرۆزەکەی تری پێ لێکدراوەتەوە. ئەوەتا چەندان ژنی موسوڵمان وەك حەزرەتی فاتیمە (رەحمەتی خوای لێ بێ) لەلایەنی چاکەو بەرزیەوە پێش زۆربەی پیاوان کەوتوون.

من هەستی خۆم لەپشت ئەم پرسیارانەوە سەبارەت بە تۆ نالێم و مەبەستم تۆ نیە، زۆر جار رەخنەو پەلپ ئاراستەی دادپەروەری خوا دەکرێ، بۆیە پێم خۆشە کەمێك لەسەر ئەم بابەتە بوەستین..

هەر لەسەرەتایشەوە دەبێ ئەوە بڵێم کە یەکسانی شتێکە و دادپەروەریش تەواو شتێکی تر، کارو کردارو بڕیارەکانی خوا لەم جیهانەدا لەسەر بناغەی یەکسانی بەرپا نابن، بەڵکو لەسەر بناغەی دادپەروەری.

خۆ ئەگەر کەمێك بیر بکەینەوە دەبینین ئەگەر بێتو یەکسانیەکی رەها لە ئارادا بوایە، هەرچی شت هەیە لە دنیای عەدەمدا نەدەمایەوە؟ یان تەنهاو تەنها یەك رەگەز بەدی دەهێنرا؟ چونکە ئەگەر جۆرێك یان رەگەزێکی تریش بەدی بهێنرێ ئەوا یەکسانیەکە تێك دەچێ...

کەواتە یەکسانیی جگە لە ئەندێشە و خەیاڵدا نابێ بوونی هەبێت، چونکە لە ژیری و دڵ و ویژداندا جێی نابێتەوە.

ئەوەتا لە نێوان ئەندامەکانی لەشماندا یەکسانی نی یە، نایشبێ هەبێت، بەڵکو هەموو ئەندامێك بەدیهێنراوە تاکو ئەو ئەرکەی پێ ی سپێردراوە رایپەڕێنێ، بۆیە بەوپەڕی دادپەروەریەوە ئەو تایبەتمەندیانەی پێ بەخشراوە تا ئەو کارە بکات.

بەداخەوە زۆرجار ئەم پرس و باسو خواسە گرنگە لەبەرچاوان ون دەبێت و نابینرێت.

ئاشکرایە کە چۆلەکەو پشیلە وەك یەكو یەکسان نین. جا بۆ ئەوەی بە ڕوون و ئاشکرایی لە هەردووکیاندا دادپەروەری خوایی بدرەوشێتەوە، دەبینی پشیلە هەموو پێویستیەکی پێ دراوە، هەر لەحاڵەتە ڕۆحیەکەیەوە تا دەگاتە چڕنووك و ددانەکانی و سوکەڵەیی جەستەی بۆ ئەوەی ببێتە پشیلە، هەروەها چۆلەکەیش بە هەمان شێوە ئەوەی پێویستی بێ، بەبێ کەم وکوڕی پێی دراوە.

ئا ئەوە دادپەروەریە...کەسیش مافی ئەوەی نیە کە بپرسێ: ( بۆچی ئەوە بووە بە چۆلەکە یان ئەوە بە پشیلە؟ ) خۆ ئەگەر ئەوەی پرسی، ئەوا پێی دەوترێ: ( چونکە ویستی خوا وابووە.) خۆ ئەگەر خودا پێچەوانەی ئەوەشی بویستایە ئەوا هەر ئەو پرسیارە دەکرا.

وێڕای ئەوەش دەمەوێ بڵێم: نەپشیلە و نە چۆلەکەیش بۆ ئەوە بەدی نەهاتوون کە بۆ جیهانێکی تر تاقی بکرێنەوە، ئاخۆ مافیان هەیە بە مافی (بوون) ێکی ئاژەڵانە بەهرەمەند ببن و لەو تاقیکردنەوەیەشدا سەرکەوتوو ببن. واتە مافی ژیانیان لەبەرامبەر سەرکەوتنێکی دیاری کراودا پێ نەبەخشراوە. خۆ ئەوان لە تاریکایی (نەبوون)دا بوون و چاوەڕێی چاکە و لوتفی خودا بوون، خوداش چاکەو لوتفی لەگەڵ کردن و (بوون)ی خەڵات کردن و جەستە و ڕۆحی ئەوانی بەدی هێنا، ئەوان ژیانی خۆیان بەڕێ دەکەن و زۆریش بە بەش و حاڵی خۆیان ڕازیو شادمانن، هەرگیز ئەوەش

بەخەیاڵیاندا نایەت ڕەخنە و ناڕەزاییەك بەرامبەر قەدەری خوایی دەرببڕن...

دەتوانی بەدیهێنانی ژن و پیاویش بەهەمان جۆر بپێوی، لەبری ئەوەی بڵێی: بۆچی خودا بە ژنی دروست کردووم؟ دەبێ چاو بە بەدیهێراوانی دەوروبەرتدا بگێڕیت و بە بەشی خۆت لە قەدەری خوا ڕازی بیت.

پاشان گرنگترین شتیش بریتی یە لەسەر ئەنجام و ئاکامی شتەکە. مادام هیچ بڕیارێك لە ئارادا نییە کە چارەنووسی هەموو پیاوان بەرەو بەهەشت ببات و چارەنووسی هەموو ژنانیش بەرەو دۆزەخ ببات، کەواتە ئەرکی هەردوو ڕەگەزەکە ئەوەیە کەسەرمایەی ئەو تەمەنەی پێیان دراوە زۆر بەجیددی بەکار بهێنن بۆ ئەوەی سەرفرازو بەختەوەری هەمیشەیی ببن.

هەر مرۆڤێکیش کە ئەو بەختەوەریە هەمیشەییەی لەکیس بچێت ئیتر چ سوودێکی پێ دەگات کە لەم ڕەگەز یان ئەو ڕەگەز بێت.

ئا بەم ئامرازەوە حەزدەکەم بڕۆم بەلای ئەو پرسیارەوە کەپێشتر تۆ کردبووت: ئایا هەموو مرۆڤەکان وەك یەك بەهرەی توانای گەیشتن بە حەقیقەتیان هەیە؟

ئەم پرسیارەش دیسان بەجۆرێك لە جۆرەکان پەیوەستە بە دادپەروەریی خوداییەوە. تۆش دەتوانی وەڵامی ئەو پرسیارە لەو

کتێبـــەوە وەربگـــری کـــە بـــەناوی ( گفتوگۆیـــەك لـــەبارەی قەزاوقەدەر)ەوە نووسیومە.[1]

لەیـــــلا خان !

پێویستە ئەم حەقیقەتەی خـوارەوە هـەرگیز لـەیاد نەکـەیت و لـە بیرت نەچێتەوە:

مرۆڤ بەندەی خودایە، تەنها خودا هەموو ئەندامێك لەئەندامەکانی جەستەی، هەموو هەست و خورپەیەك لە خورپەکانی ڕۆحی، هـەموو توانایـەك لـە تواناکـانی پـێ خـەڵات کـردووە. هـەر هـەموو ئـەم گەردوونەیش موڵکی خودایە، ئەم مرۆڤە لاوازەیش میوانێکی ئـازیز و بەڕێزە لەلای ئەو.

بەڵێ، ئێمە میـوانێکی ڕێـز لـێ گیراویـن...ئـەرێ وانیـە؟ ئـەوەتا ڕۆژانە بێ ئەوەی هەست بکەین ملیارەهـا لـە خانـەکانی جەسـتەمان دەگۆڕێن...ئەم گـۆی زەمینـەش کـە لەسـەری دەژیـن بەخێراییـەکی سـەیرەوە دەسـوڕێتەوە، کەچـی ئێمـە تۆزقـاڵێکیش هەسـتی پـێ ناکـەین، لەگـەڵ هـەموو هەناسـەیەکماندا بـەو کـرداری هەناسـەدانە خوێنمـان پاکـژ دەبێتـەوە، هەستیشـی پـێ ناکـەین کـە ئەمـەش سەبارەت بە ئێمـە زۆر گرنگـە...بـەڵکو ئێمـە سـەرگەرمی کارەکـانی خۆمانین‌و هیچ ئەندامێکی جەستەی خۆیشمان نایەت بە بیردا مەگەر

---

١- ( گفتوگۆیەك دەربارەی قەزاو قەدەر ) ئەم پەڕاوەمان وەرگێڕاوەتـە سـەر زمـانی شیرینی کوردی و تا ئێستاش سوپاس بۆ خوا چەند جارێك چاپ کراوەتەوە.

ئەو کاتەی تووشی ئازارێك دەبێت. بەکورتی، ڕۆژانە لە پێناو ئێمەدا چەندین کارو چالاکی لە ژمارە بەدەر ڕوو دەدەن، سا لە ناو جەستەی خۆمان یان لە جیهانی دەرەوەماندا بێت، کەچی ئێمە هەستیان پێ ناکەین و هیچ موشورێکیان ناخۆین، بەڵکو هەر سەرقاڵی کاری ڕۆژانەی خۆمانین.

پەروەردگارمان کە بەو بایەخ و سۆزو میهرو بە تەنگەوە هاتنەوە مامەڵەمان لەگەڵدا دەکات، بێ گومان لە ڕۆژی دواییشدا بەوپەڕی دادپەروەریەوە مامەڵەمان لەگەڵ دەکات.

قورئانی پیرۆز دەفەرمووێ: ﴿لاَیُکَلِفَ الله نَفسَا الا وسعَها﴾.

ئەم بڕیارە سەبارەت بەگەیشتن بەحەقیقەتیش هەر کاریگەرەو کاری پێ دەکرێت...ئەوەتا هەموو مرۆڤێك بەندەی خودایە، خودای تەعالا خۆی باشتر دەزانێ کە هەر مرۆڤێك تا چ سنوورو مەودایەك دەگات بە حەقیقەت...هەموو بەندەیەکیش هەر لەسەر ئەم بنچینەیە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ...خودا هەرگیز موحاسەبەی کەس ناکا لەسەر شتێ کە لە توانای ئەو کەسە بەدەر بووبێ.

قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿هَل یَستَوی الذین یَعلَمُونَ و الذِینَ لایَعلَمون﴾ ئەم ئایەتەش بەجۆرێك لەجۆرەکان ئاماژە بۆ ئەم لایەنەی ئەو پرس و باسە دەکات.

لە ڕۆژی قیامەتو دادگای هەرە گەورەشدا هەموو مرۆڤێك بە گوێرەی ئەو هەلومەرج و بارودۆخە موحاسەبە دەکرێ کە گوزەرانی

تیادا کردووه، چ هەژار بووبێ یا دەوڵەمەند، زانا بووبێ یا نەزان، موسوڵمان بووبێ یان بێ ئاگا لە ئیسلام، ئا لەو ڕۆژەدا هەرکەسێ تۆسقاڵێك کرداری چاکەی کردبێ دێتەوە ڕێی... هەرکەسێکیش تۆسقاڵێك کرداری خراپەی کردبێ دێتەوە ڕێی... ئا لەو وەختەدا دادپەروەری خودایی بەوپەڕی شکۆو سامو هەیبەتیەوە دەدرەوشێتەوە...

جا کێ دەڵێ ئەوانەی ڕەخنە لە قەدەری خوا دەگرن و دەپرسن: ( ئایا هەموو مرۆڤێك هەمان هەلی دەست دەکەوێ بۆ گەیشتن بە حەقیقەت؟ ) کێ دەڵێ ئەوانە لەو ڕۆژگارەدا شایستەی سزای خوا نابن؟ یان ئەوانەی کە خۆیان وا دەرخستووە بەرگری لەوان دەکەن و لەبری ئەوان ئەو پرسیارەیان کردووە کە چاوپۆشیان لێ دەکرێت و ڕزگار دەبن و لە ئاگری دۆزەخ قوتاریان دەبێ؟

کەواتە ئەوەندەی توانات هەیەو دەتوانی باسی حەقیقەت بکەو ڕاڤەی بکە، بەڵام بۆ یەك ساتیش ئەوەت لەبیر نەچێتەوە کە خودای تەعالا دادپەروەرە...لە ناخی دڵتەوە متمانەت بەمە هەبێ...کاتێکیش کە سۆزو بەزەییت بە خەڵکدا دێتەوە ئاگات لەخۆت بێ، خۆت نەخەیتە نێو مەترسیەکی مەعنەویەوە. نەکەی ئەوەت لەبیر بچێتەوە کە ئەوانیش بەندەی خودای تەعالان...

لە کۆتاییشدا پێم خۆشە پێناسەی ( ستەم )ت بۆ بکەم: (ستەم بریتیە لە ڕەفتارکردن لەناو موڵکی کەسانی تردا بێ ڕەزامەندی یان

مۆڵەتی ئەوان...) لەبەرئەوەی خودای گەورە پەروەردگارو خاوەنی هەموو خەڵکە، کەواتە هەرگیز هیچ رەفتارێك یان کردارێك لە تەرەفی ئەوەوە بەستەم ناژمێردرێ و ناچێتە ناو پێناسەی ستەمەوە.

پێویستە بەچاکی لەمە تێبگەی...هەروەها پێویستە بزانی دادپەروەریی رەها تەنیا تایبەتە بە خوداوە، ئەو خودایەی کە دارای زانستی رەهاو توانای رەهاو دانایی رەهاو سۆزو میهری رەهایە.

پێم وایە بۆ ئەم نامەیە ئەمەندە بەسە...والسلام.

پاش چەند رۆژێك ئەم نامەیەم بۆ نووسی:

بۆ ئەو لەیـــــــــلایەی کە حەقیقەتی دۆزیوەتەوە...

وام دەزانی کە بە نامەکەی پێشوو کۆتاییم بە باسی بابەتی یەکسانی ژن‌و پیاو هێناوە، کەچی رووداوێك روویداو ناچاری کردم لەسەر ئەو بابەتە زیاتر بنووسم. پێش چەند رۆژێك گۆڤارێکم گرت بەدەستمەوەو پەرەکانیم هەڵ دەدایەوە، ئەو گۆڤارە ( خوێندنگایەکی ئەهلی) دەریدەکات. خوێندنەوەی یەکێك لە باسەکانی وای لێکردم زۆر بە قووڵی بیر بکەمەوە. پوختەی ئەو بابەتە ئەمە بوو:

" پێویستە چیتر بەسەیرو نامۆ نەزانرێ کە کچو کورە گەنجەکان پەیوەندی دڵداری‌و ئارەزووبازی پێکەوە ببەستن، دەبێ ئەمە بەمەترسی تەماشا نەکرێ، هەرکەسیش وابکات دیارە ئەوە بیرێکی دواکەوتوو و کۆنەپەرستانەی هەیە.."

کاتێ ئەم بابەتەم خوێندەوە یەکسەر سێ بنەماکەی کۆمەڵگای ئەوروپایی نوێم بە زەیندا هاتن، من پێشتر لەبارەی ئەو بنەمایانەوە پەڕاوێکم خوێندبووەوە. ئەو سێ بنەمایەش ئەمانەن:

١- یەکسان بوونی ژن و پیاو.

٢- لەڕووی گوزەرانەوە (واتە لەڕووی ئابوری و داراییەوە) ژن سەربەخۆ بێ لە مێردەکەی.

٣- پاش ئەوەی کە ژن لەلایەنی دارایی‌و گوزەرانیەوە ئازادو سەربەخۆ بوو، با ژن لەوەشدا ئازاد بێت کە پەیوەندی لەگەڵ پیاوانی تریشدا دابمەزرێنێت...

بنەمای یەکەم‌و دووەم تەنها ئامرازن، ئامانجی سەرەکی‌و کۆتایی لە بنەمای سێیەمدایە.

ئەوانەی کە هەمیشە لەبارەی یەکسانی ژن‌و پیاوەوە دەنووسن، تا ئێستا نەیان توانیوە ژنانمان پەلکێش بکەن و بیانگەیەننە ئەم خاڵەی سێیەم، هەروەها نەیان توانیوە هەستی شەرم و حەیا و پاکیی و ئیخلاص لە ژناندا ئەوەندە لاواز بکەن کە ئومێدیان پێ دەخواست و هەوڵیان بۆ دەدا، هەر بۆیە زۆر لەمە تووڕەو زویرن.

خاوەنی ئەو بابەتەش یەکێك بوو لەو زویرانە.

هەر بەو بۆنەیەوە دەمەوێ بڵێم:

کچ زۆرجار لە تەمەنی دوانزە سیانزە ساڵاندا باڵغ دەبێت. بەڵام کوڕ لەتەمەنی چواردە پانزە ساڵاندا باڵغ دەبێ. بۆیە کچ پاڵێوراوە

که ببێته دایك و کوڕیش پاڵێوراوه کـه ببێتـه بـاوك. پێویسـته چـهند ساڵێك پێش ئهوهی بگهنه باڵغ بوون بهباشی باسی ههستی شـهرم و حهیاو مانای شهرهف و ئابڕوو و پاکداوێنییان بۆ بکرێت. بـهڵام ئـهو ناوهندو ڕێکخراوه ناسراوانه ههوڵ دهدهن ئهو تهمهنه درێژ بکهنهوهو وهك لاستیك ڕایبکێشن تا ئهو ساڵهی کچـه گهنجهکـه شـوو دهکـات. ههروهك بڵێی داخوازیهکانی شهرهف و داوێـن هـیچ پێویسـت نـهبن و دهست پێ نهکهن تا کاتی هاوسهرگیری‌و دوای هاوسـهرگیری، بـهڵام پێش هاوسهرگیری ههرچی پهیوهندیهکی ناشهرعی‌و نادروست ههیـه ههمووی به ئاسایی دادهنرێت و دهبێ به شـتێکی سروشـتی تهماشـا بکرێت و پێویست به ترس ناکات.

ههرگیـــــــز ناکرێت لهم لۆژیکه تێبگهین.

بۆچـی ڕێ بـه کـچ بـدرێ لهگـهڵ پیـاوانی بێگانـهو نـامۆدا بچـێته دهرهوه، کهچی پاش هاوسهرگیری ڕێی پـێ نـهدرێ؟ لام وایـه ئهمـه کاکڵهی بابهتهکهیـه. ئـهو ناوهنـدو مهڵبهنـده گوماناویانـه کـه حـهزو ئارهزوویان ئهوهیه ههموو ژنان پهیوهنـدی ناشـهرعی لهگـهڵ هـهموو پیاواندا پێك بهێنن، زاتی ئهوهیان نیه که ئهم ئارهزووهی خۆیان بـه ئاشـکرا بـاس بکـهن، بۆیـه بابهتهکـه لـول دهدهن‌و دهورو خـولی پێـدهدهن‌و وهھـا دهری دهخـهن گوایـا بابـهتی لاوان و قۆنـاغی گهنجێتییـه... چـونکه چـاك دهزانـن ئهگـهر لـهم ههنگاوهیانـدا سهربکهون ئهوا زۆر نزیك دهبنهوه له ئامانجه سهرهکیهکهیان.

ئـەو ڕاپۆرتـەی لـەو گوتـارەدا خوێندمـەوە تـەنیا نموونەیـەکی بچـکۆلەی ئـەو یاریـە گەورەیـە کـە دەرهـەق بـەلاوەکانمان ئـەنجام دەدرێـت و، بەشـێکی ئـەو نەخشـەو پیلانـە گـەورەو ترسـناکەیە کـە دەیانـەوێ تـۆڕو تەیمانەکـەی بەدەوریانـدا بچـنن. ئـەم گەمەیـە ئـەو بەڵێنـەی شـەیتانی بـەبیر هێنامـەوە کەبـە خـۆی داوە، هـەروەها خواستو چەشەی شەیتانی بـیر خستمەوە. ئـەوەتا قورئـانی پـیرۆز باسی ئەوە دەکات کە کاتێ شەیتان ملی نەدا سوژدە بۆ ئادەم ببات و بـەهۆی ئـەو مـل نـەدانو یـاخی بوونەیـەوە لەبەهەشـت دەرکـراو نەفرەتی لێ کرا، شەیتان وتی: ﴿ لأتَّخِذَنَّ مِنْ عِبَادِكَ نَصِيباً مَفْرُوضاً * وَلأضِلَّنَّهُمْ وَلأمَنِّيَنَّهُمْ...﴾ النساء:١١٨-١١٩ .

پاشـان بـەم جـۆرە دوایـی بـە هەڕەشـەکەی دێنـێ: ﴿ وَلآمُـرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللهِ.﴾ النسـاء: ١١٩ ، واتـە: فەرمانیشـیان بـۆ دەردەخـەم تەرح و بیچمی ئەو شتانەی خوا کردوویە تێکی بدەن و بیگۆڕن.

لێـرەدا دەقـی تەفسـیری ئـەم ئایاتـەی دواییـت لـە یـەکێ لـە تەفسیرەکانەوە بۆ دەنووسم:

(...ژن دەکـەن بـەپیاو، پیـاویش دەکـەن بـە ژن، دەسـتبەرداری هاوسـەرگیری دەبـن بـۆ ئـەوەی لابـدەن و پـێچ بکەنـەوە بـۆ زینـا کـردن...واز لـە ئـەرك و فـەرمان و واجبـەکانیان دێـننو سـەردەکەنە ڕابـواردنو بـەدڕەفتاری...لای ئـەوان ڕاسـتگۆیی دەبێتـە گێلـیو گەمـژەیی، فێـڵ و سـاختەیش دەبنـە زیرەکـی و نیشـانەی زرنگـی و

وریایی... لای ئەوان خراپە دەبێتە چاکە، چاکەیش دەبێتە خراپە... ئەوەی پێویستە بنیات بنرێ ئەوان دەیڕوخێنن، ئەوەیش پێویستە بڕوخێرێ ئەوان بینای دەکەن و ئارایشی دەدەن....

لە ئایینی راست و تەوحید لادەدەن و وەردەگەڕێن، وەك عارەبانە ڕادەکێشرێن بەدوای ئاین و بیروباوەڕە پوچ و بەتاڵەکان...)

لەو کاتەدا کە ئەم دێڕانەم بۆ تۆ دەنووسی، کتوپڕ ئەم خوتورەیەم بە خەیاڵدا هاتو بەخۆم وت:

" تۆ لەبیرت چۆتەوە کە لەیلا ئەم نامەیە بۆ هاوەڵەکانیشی دەخوێنێتەوە، خۆ هێشتا نازانی ئاخۆ ئەو هاوەڵانە باوەڕیان بە شەیتان هەیە یان نا." بۆیە بڕیارمدا (ئەگەر بەکورتیش بێ) شتێك لەبارەی شەیتانەوە بنووسم:

یەکەمین فێڵ و ساختەی شەیتان ئەوەیە کە لەلای شوێنکەوتوانی ئینکاری لەبوونی خۆی دەکات، دەمەوێ یەکەمجار دانایییەکی کورت سەبارەت بەم فێڵەی شەیتان بنووسم:

مادام چەندەها ئایەت لەبارەی شەیتانەوە هاتوون و ئینکاری کردنییەك ئایەتیش بەسە بۆ ئەوەی مرۆڤ لە سنووری ئیمان دەربکات، کەواتە زۆر ئاسایی و بەڵگەنەویستو سروشتیە کە شەیتان ئەزموونی ئەو ڕێبازە بکات، کە ئینکاری بوونی شەیتانی کرد ئیتر لە ڕیزی شەیتاندا دەوەستێ.

با لە دەوورو بەرمان ڕابمێنین...

با ساتێك وردبینەوەو بیر لە چیاكانو دارو بەرد و گیانداروو هەورو هەورە بروسكەو خۆرو مانگو ئەستێرەكان بكەینەوە. خۆ هەموو ئەم بوونەوەر و رەگەزانە بوونێكی ماددیان هەیە، كەچی چەندەها جیاوازی گەورەو ئاشكرا لە نێوانیاندا دەردەكەون.

با ئێستا بیر لەو شتانە بكەینەوە كە ناتوانین بە چاو بیان بینین: كێشی زەوی، تیشكی ئێكس، تیشكدانەوەی ماددە تیشكدەرەكان، فریشتە و جنۆكەو شەیتانەكان...

هەموو ئەم بوونەوەرانەیش لەنێوان خۆیاندا تەواو جیاوازن. بۆیە دەتوانین بڵێین چەندێ ئاگر لە خاك جیاوازە، شەیتانیش ئەوەندە لە مرۆڤ جیاوازە. هەروەك تاریكی لە ڕووناكی جیاوازە، هەر بەو جۆرە جنۆكەیش لە فریشتە جیاوازە.

لێرەدا كۆپلەیەكی بچوك تۆمار دەكەم كە بەشێكە لە ڕاپۆرتێك و لەپەرچ دانەوەی هەڵگرانی بیردۆزەی پەرەسەندندا كە ئینكاری بوونی ڕۆح دەكەن، نوسیبووم:

وا بیر بكەنەوە دووكەس هەنو یەكێكیان بڕوای بە بەدیهێنان هەیەو ئەوی تریان بڕوای بە پەرەسەندن هەیە. با لەو كەسەیان بپرسین كە سەر بە تیۆری پەرەسەندنە:

چ ئەندامێك لە ئەندامەكانی ئەو دوو كەسە بڕوای بە بەدیهێنان یان پەرەسەندن هەیە؟ ئایا دەستەكانیان یان قاچەكانیان بڕوایان هەیە؟ سیەكانیان یان گەدەیان؟ خوێنیان یان خانەكانی مێشكیان؟

بێگومـان وەڵامـی بـۆ ئـەم پرسـیارە ئەوەیـە کـە دەڵـێ: ( هـیچ ئەندامێك نی یە.)

ئەگـەر لێـی بپرسـی: " کەواتـە کـێ هـەڵگرو خـاوەنی ئـەم دوو بیردۆزە پێچەوانەو دژ بە یەکەیە؟" ئەگەر ئەم پرسیارەی لێ بکـەین ئەوا نازانم چ وەڵامێك دەداتەوە.

بەم جۆرە لەیـــلا! هەروەك ئەو کەسەی لە ناو نموونەکەماندایە و بڕوای بە بەدیهێنان یان تیۆری پەرەسـەندن هەیـە و نـاتوانێ ڕۆحـی خـۆی ببینـێ و بەرچـاوی کـەویێو ماهیـەتی نـازانێ، بۆیـە نـاتوانین شەیتانێك ببیـنین یـان ماهیەتەکـەی شـارەزا ببین کـە هـەوڵ دەدات مرۆڤ لە ڕێی ڕاست لابدات. بەڵام نابێ پەی نـەبردن بـە ماهیەتەکـەی بەرەو ئینکاری کردن لە بوونی ئەومان ببات.

هەروا پـێم خۆشـە ئامـاژە بـە بابـەتێکی گـرنگیش بـدەم و داوات لێدەکەم بەباشی بیری لێ بکەیتەوە:

مرۆڤ بە وشەو (وتەکان) ناتوانێ کە گوڵێـك یـان عـەترێکی خـۆش بوێت. ئەو بەبێ بەکارهێنانی وشـەکان خۆشەویسـتی دەکـات، بـەڵام کاتێ ئارەزووی گێڕانەوەو باسی ئەم هەستانەی دەکات بـۆ کەسـانی تر دەبینین بـۆ وەسـف کـردن و باسـکردنی خۆشەویسـتیەکەی پـەنا دەباتە بەر بەکارهێنانی وشەو گفتار.

کەواتە شەیتان دەتوانێ خۆی بسەپێنێ بەسەر ئـەو مرۆڤـەدا کـە بـەبێ وشـەکاری خۆشەویسـتی دەکـاو دەترسـێ. دەتـوانێ بـەبێ

گفتاریش قسەی لەگەڵ بکات و وانەی دابدات و بەبێ وشەو گفتار ئەوەی کە مەبەستیەتی پێی بڵێت. ئێمەش بەو قسەو باس و وانانەی شەیتان دەڵێین: ( وەسوەسە).

ئەگەر مرۆڤێك بیەوێت سەر لە مرۆڤێکی تر تێك بدات و بیروڕای هەڵەی پێ بڵێ، دەبینی بۆ ئەو مەبەستە وەك ئامرازێك " وشە " بەکاردێنێ. ئا لێرەدا مرۆڤ دەتوانێ ئەو کەسە بناسێ کە هەوڵ دەدات ئەو بیروڕایانە بخاتە مێشکیەوە.

بەڵام مرۆڤ بەو ڕوون و ئاشکراییە ناتوانێ شەیتان بناسێ، خۆ ئەگەر ئیمانەکەی بەهێز نەبێت وا دەزانێ کە دڵ یان عەقڵی بوونەتە سەرچاوەو کانگەی ئەو وەسوەسەیە، بۆیە بەم گومانەی لەڕێ لادەدات بەرەو ئینکاری کردنی بوونی شەیتان.

بەهەرحاڵ نەختێ لە باسەکەش دەرچووین، بابگەڕێینەوە سەر ئەسڵی باسەکەمان.

شەیتان بەگوێرەی سوێندەکەی هەوڵ و تەقەلا دەدات کە بیچم و پێکهاتەی مرۆڤ تێك بدات و بیگۆڕێ. هەوڵی ئەوە دەدات ژنان وای بکات وەك پیاو ڕەفتار بکەن و پیاویش خۆی وەك ژن لێ بکات. جا بۆ ئەوەی نەکەوینە داوی ئەم فێڵەی شەیتانەوە، پێغەمبەرمان ﷺ لە فەرمایشتێکدا هۆشیاری پێداوین: ( لَعَن رسولُ الله ﷺ المتَشَبِّهِينَ مِنَ الرِّجالِ بِالنِّساءِ والمُتَشَبِّهاتِ مِنَ النِّساءِ بِالرِّجال ) واتە:

پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرەتی کردووە لەو پیاوانـەی خۆیـان وەك ژن لێ دەکەن و لەو ژنانەش کە خۆیان وەك پیاو لێدەکەن.

ئێمە هەرگیز زەبرو خۆسەپاندن، یان پیـاوەتیو یـاخی بـوون لـە ژنان چاوەڕێ ناکەین، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئـیخلاص و گوێڕایـەڵی و تەوازع و نەرم و نیـانیو هەسـتە ناسـکەکانی وەك سـۆز و بـەزەیی و میهرو پاکداوێنیان لێ ڕەوا دەبینین، ئەوەیش کە لەپیاوی ڕادەبیـنین ئەوەیە کە سـتەم لـە ژن نـەکات و زەلیـل و دامـاوی دەسـتی ژنـیش نەبێت. بەڵکو ئەرکی خۆی ئەنجام بدات کە بریتیە لـەوەی بەوپـەڕی سۆزو میهرەوە بیپارێزێ و پێداویستیەکانی بۆ دابین بکات.

ئەوەی کە ژنان دەیکەنو خۆیان وەك پیاو لـێ دەکـەن بەڕاسـتی مایەی شین و زاریە، زۆریش لە ڕێزو بەهاو پلەی ژن دادەشکێنێ.

لام وایە ئەم نموونەیە باشتر بابەتەکەمان بۆ شرۆڤە دەکات:

بێنـە بەرچـاوی خـۆت پیاوێـك دەیـەوێت لاسـایی ژنـانی ئـەوروپا بکاتەوە: وا دەستی کرد بە درێـژکردنو بۆیـاخ کردنـی نینۆکـەکانی، پاشان تەنورەیەکی پەمـەیی تـۆخی کـردە بـەری و پێڵاوێکـی پاژنـە بەرزی کردە پێی و قـژی درێـژکرد و شـانەی کـرد و پەخشـانی سـەر شان و ملی خۆی کـرد و لـە شـێوەی قسـە کردنیشـیدا مـەکرو نـازی نواند...

ئایا هەرگیز دەتوانی لەو پیاوەدا چاوەڕوانی ئـەوە بکـەی کـە بـە پیاوانەو بە دەنگێکی پیاوانەوە ڕەفتار بکـات و ئەوەنـدە ئـازاو چـاو نەترس بێت کە مرۆڤ سەرسام بکات؟

هەروەها ئەو ژنەیش کە خۆی وەك پیاو لێ دەکات وردەوردە بێ ئەوەی هەست بە خۆی بکات لە ڕەفتارو گوزەرانیدا بەرەو ئەوە دەڕوات کە خوو بە ڕەفتارو داب و نەریتی پیاوانەوە بگرێت، ئیدی ڕۆحە ناسکەکەی و داب و نەریتە ناسك و نەرمونیانەکانی دەگۆڕێن بۆ ڕۆحێکی زبرو داب و نەریتێك کە فڕی بە (مێینەوە) نییە.

ئەگەر چاوێك بەدەوری خۆتدا بگێڕی چەندەها نموونەی لەم جۆرە بەدی دەکەی.

من لێرەدا کە دوایی بە نامەکەم دەهێنم دەمەوێ هەرگیز ئەوەت لەبیر نەچێ کە زۆرینەی لاوان نەدەگەیشتن بەمجۆرە ئاستە ئەگەر پلان‌و نەخشەی بۆ داڕێژراو و هەوڵی خەست‌و خۆڵی شەوانەو ڕۆژانە نەبوایە. بۆیە پێویستە کە لەو لاوانە زویرو تووڕە نەبی، بەڵکو بەزەییت پێیاندا بێتەوەو بۆیان بگری‌و دەستی یارمەتیان بۆ درێژ بکەیت‌و حەقیقەتیان بۆ لێك بدەیتەوە و چەندێك بۆت رەخسا ئامۆژگارییان بکە.

والسـلام.

*****

پاش پانزە ڕۆژ وەڵامی (لەیلا خان )م پێگەیشت... لە نامەکەیدا پاش ڕێزو سەلام نووسیبووی:

(من دەزانم کە ئێوە تا ئێستا زۆر ماندوو بوون لەگەڵمدا، چونکە هەرچی پرسیارێکم کردبێ وەڵامتان داوەتەوە... نازانم چۆن

سوپاستان بکەم، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەوپەڕی ڕێزو پێزانینی خۆم دەربڕم بۆ خەسڵەتێك کە لە ئێوەدا بەدیم کردووە و خۆم پێ ناگیرێ و دەبێ ئاماژەی پێ بدەم.

بەدرێژایی ئەم ماوەیەی کە وەڵامی پرسیارەکانی منت داوەتەوە: هەرگیز لە سنووری وەڵامی پرسیارەکان نەترازاوی، هەوڵیشت نەداوە هیچ شتێکی تر بدەی بە گوێمدا. بۆ نموونە: پێت نەوتوم ئەو بەرگە لەبەربکە، یان ئاوا نوێژ بکەو ئاوا ڕۆژوو بگرە... بەڵام چاك دەمزانی کە لەناخی دڵتەوە پێت خۆشە کە من وابکەم، بۆیە تکا دەکەم ڕێم بدەی کە پیرۆزبایت لێ بکەم لەسەر ئەو هەموو ئارامەی کە لەگەڵ مندا گرتت.

ئەوەشت لێ ناشارمەوە کە دەمەوێ هەواڵێکتان پێبگەیەنم... هەواڵێکە تێکەڵە بە مزگێنی و ناسۆر... بەڕاستی بڕیارم داوە کە پۆشاکی ئیسلامیانە بپۆشم، کاتێ ئەو بڕیارەمدا و ئاشکرام کرد، چ لەلایەن خزمەکانم یان لەلایەن هاوەڵانو ناسراوەکانمەوە زۆر بەتوندی بەرپەرچ درامەوە..

من زۆر هەوڵم دا کە تێڕوانینی خۆمیان بۆ باس بکەم و ئێستەش هەر هەوڵ دەدەم، بەڵام زۆر غەمبار و دڵتەنگم چونکە هەندێ لە هاوەڵ و دەستە خوشکەکانم شتی زۆر دژی ئیسلام دەڵێن، بەوەش دەکەونە گوناهێکی گەورەوە....

پێش چەند ڕۆژێك مامۆستای (كیمیا) پێی وتم: من ئازادم چیم پێ خۆشە ئەوە دەپۆشم. كەچی مامۆستای (فیزیا)یش بۆ پشتگیری ئەو وتی: بۆچی جوانیی خۆم بشارمەوە؟

خۆ كەش‌وهەوای خێزانەكەشم دنیایەكی ترە... جارێكیان كچێكی خزمم فەتوایەكی پێشكەش كردم و وتی: بۆچی بەرگی ئیسلامان حەرامە؟.. گوێ مەدە بەقسەی خەڵك، خۆ لە ئیسلامدا مەرجێكی لەو جۆرە نی یە. خزمەكەی تریشم ترسی دەخستە بەردەمم و دەیوت: داپۆشینی قژەكانت گوناهێكی یاساییە. كچە خاڵەكەشم كە پێش چەند ڕۆژێك لە زانكۆ تۆمار كراوە پێی وتم: من دژی ئەم بەرگەم، دژی شاردنەوەی خۆم و داپۆشینی سەری خۆمم.. ئەی چۆن شوو بكەم بە پیاوێك كە بەچاكی نەیناسم؟ ئەی مافی ئەوەم نییە قسەی لەگەڵ بكەم و لەهەموو لایەن‌و ڕووەكانەوە بیناسم؟ بەڕاستی قسەكانیان منیان دڵتەنگ كرد، بگرە منیان حەپەساند.

هەرسێ لاپەڕەی نامەكەی لەیلا پڕ بوون لە ئازارو ناسۆرو جەور كێشان...لە كۆتاییدا نووسیبووی:

" من هەر ڕۆژێ تووشی جۆرە پەلامار و هێرشێك دەبم، بەلام ئارام دەگرم و بەخۆم دەڵێم: ئەمە قۆناغێكەو تێدەپەڕێ و كۆتایی دێ..." وا من چاوەڕێی ئەوەم كە لە هەگبەی پاشەڕۆژدایە.

لەم نامەیەدا لەیلا هیچ پرسیارێكی تایبەتی لێ نەكردم. بەڵكو تەنها باسی ئەو هێرش و دوژمنایەتیەی كردبوو كە بەرەو ڕووی

دەبێتەوە و سەرو دڵی دەگرێت. بەڵام وا دیار بوو حەزی لەوەبێ کە من شتێکی بۆ بنووسم، چونکە لەگەڵ هەردێرێك لە دێرەکانی نامەکەیدا هاوارو داو بێدادیەك هەبوو لەگەڵ حەزێك تا من دڵی بدەمەوەو دڵخۆشی بکەم.

بۆیە بە پێویستم زانی ئەم نامەیەی خوارەوەی بۆ بنووسم:

بۆ ئەو (لەیـــــــلا) یەی کە لە پێناو حەقیقەتدا ئازار دەچێژێت.

بەختەوەری هەردەم لە ئەنجامو بەروبوومی بڕیار و خۆ یەکلا کردنەوەو دان بەخۆدا گرتن و ئازار و ناسۆرا بووە...منیش دڵم نایەت پێت بڵێم کە بەهۆی هەموو ئەو هێرشانەی دووچاریان بووی من زۆر دڵتەنگ نەبووم بۆ حاڵت، چونکە چاك دەزانم کە ئەو ڕووداوانە زیاتر تۆ گۆش دەکەن و پێت دەگەیەنن و زیاتر فێرت دەکەن.

خۆ ئەوەی نوسیبووت سەبارەت بە من شتێکی نوێ نیە، چونکە ئەو تۆمەت و پاگەندەو تەشەرانە چەندانساڵە ئاراستەی ئێمەش دەکرێت.

ڕۆژگار تێدەپەڕێ و دەگۆڕێ، خەڵکیش بەرودواو یەك لەدوای یەك لە دنیا دەردەچن و دەمرن، بەڵام بیروڕای چاك و بیروڕای پیس وخراپ هەر دەمێنێتەوە و لەناو ناچێ‌و ئەمەش تا ڕۆژی قیامەت بەردەوام هەروا دەبێ.

دەمەویٚ لێرەدا بڵێم:

لەم جۆرە مشتومڕانەدا سیٚ چەمك هەن تێکەڵ بە یەکتری دەبن کە بریتین لە چەمکەکانی (نەنگی)، ( گوناه ) و (خەتا)...

ئەگەر هەر گفتار یا ڕەفتار یان پۆشاکێك پێچەوانەی دابو نەریت بوو بە نەنگی دادەنرێت، ئەگەر پێچەوانەی یاسابوو بە گوناه دادەنریٚ، ئەگەر پێچەوانەی دین بوو بە خەتاباری دادەنریٚ.

کەسانیٚ هەن وادەزانن ئەگەر کارێك پێچەوانەی یاسا نەبوو بە (خەتا) دانانرێت، هەروەها کەسانی وایش هەن خەیاڵیان وایە کە: ئەگەر کارێك باوبوو، هەموو خەڵك دەیانکرد، ئیتر لە گوناه و خراپە دەردەچیٚ.

بۆچوونی هەردوولا هەڵەیەکی ئاشکرایە.

هەرگیز نەنگی پێوەرێکی ڕاست و دروست نەبووە بۆ حەقیقەت. ئەوانەیش لەناو کۆمەڵگادا تەنیا بەگوێرەی چەمکی نەنگی هزرو بیرو ڕەفتاریان ڕێك دەخەن، کەسایەتی خۆیان دەکەنە قوربانی لە پێناو کۆمەڵگەدا و دەبنە دیل و بەندی قەڵەباڵغی و مەرجەکانی جەماوەر.

جا ئایا هەرچی کۆمەڵگە ڕەتی کردەوە هەڵەیە، هەرچیش کۆمەڵگە پێی ڕازی بوو ڕاست و دروستە؟ خۆ ئەگەر وا بوایە دەبوو مرۆڤ بۆ هەر کۆمەڵگەیەك کاڵای کەسایەتیەکی نویٚ بپۆشێت و وەك ( حەربا ) بەگوێرەی دەوروبەرەکەی ڕەنگی خۆی بگۆڕێت.

یەکێ لە ئەدیبەکانی خۆرئاوا لە باسکردنی لاوازی عەقڵی مرۆڤایەتیدا نووسینێکی جوانی هەیەو ئەم پرس و باسەی ئێمەش ڕوون دەکاتەوە:

لەوە دزێوتر نیە کە مرۆڤێك هەڵسێ بە خواردنی گۆشتی باوکی خۆی، چونکە هەرگیز ناکرێ بیر لە کارێکی دزێو و نالەباری لەو جۆرە بکرێتەوە. بەڵام ئەم نەریتە لەناو هەندێك لە میللەتە پێشووەکاندا هەبووە. ئەم دابو نەریتە وەك دەربڕینی ڕێزو خۆشەویستی بۆ باوك پیادە دەکرا، چونکە مەبەستیان ئەوە بووە کە باوکی مردوویان بۆ باشترین و گونجاوترین گۆڕ کۆچ بکات و گۆشت و خوێن و یادەوەریەکانی ئاوێتە بێن لەگەڵ خوێن و دەمار و جەستەی ئەواندا و، بۆ جارێکی تر ئەو باوکە مردووە پاش کرداری هەرس کردن لەناو جەستەی ئەواندا خۆی بنوێنێ. بۆیە ئەوانەی بڕوایان بەم بیروباوەڕە هەیە بەلایانەوە ئاساییە کە گەورەترین گوناه و تاوان بەرامبەر دایك و باوکیان دەکەن ئەگەر لێیان بگەڕێن لەناو چاڵێکی تاریکدا بن و جەستەیان هەڵوەشێت و کرم و مار پەلاماریان بدەن.

**با ئێستا بیر بکەینەوە:**

ئەگەر لەناو کۆمەڵگەی خۆماندا زۆرینەی خەڵك لەئەنجامی پڕوپاگەندەی زۆر و چڕوپڕەوە بڕوایان بەم نەریت و بیرۆکەیە هێنا، ئایا ئێمەش هەستین دەست بکەین بەخواردنی گۆشتی دایك و

باوکمان تا کۆمەڵگە سەرزەنشتمان نەکەن و بە عەیبە لەسەرمان حیساب نەکرێ؟!

کەواتە چەمکی (عەیب) چەمکێکی خۆیی (Subjective)ەو لەڕاستیدا هۆکارێکی بە بڕشت و کاریگەر نی یە.

ئەوەش کە دەڵێ گوایە پۆشینی بەرگی ئیسلامیانە لە ڕووی یاساوە تاوانە، ئەوە ئەسڵی نیەو وڕێنەیە، چونکە هیچ سەردەمێك نەبووە بەناوی یاساوە بەرگی بالاپۆشی تیادا قەدەغە بکرێت... هەر بیروڕایەکیش کە لەم بارەیەوە بلاو کراوەتەوە جگە لە بۆچوونی کەسیی و ڕەنگدانەوەی بیروباوەڕو ئایدۆلۆجیایەکی لارو چەوت هیچی تر نییە.

ئەوانەیش کە هاواری شێتانەیان لێ هەڵساوەو هاواردەکەن: (عالمانیەت لە مەترسیدایە... کۆنەپەرستی هێرشمان دەکاتە سەر) کاتێ کچێکی لاو دەبینن بەرگێکی ئیسلامیانەی لەبەردایە ئاگریان تێ بەردەبێت و وادەزانن دنیا وێران بووە.

لەم ڕۆژانەدا پەڕەکانی گۆڤارێکم هەڵدایەوە بینیم هەر هەمووی لەمسەر بۆ ئەوسەری لەبارەی باسەکانی بالاپۆشیی ئیسلامی و عالمانیەت و کۆنەپەرستییەوەن، دەت وت ئەو ژمارەیەی تایبەت بووە بە باسی (کۆنەپەرستی)یەوە.

هەرکە بابەتێکم دەخوێندەوە بەخۆمم دەوت: بەڵێ !...ئەم نووسەرە دەبێ کتومت بەم شێوەیە بیر بکاتەوەو بۆچوونی بەم

جۆرە بێت، یان: جگە لەمە هیچی تر لەو نووسەرە چاوەڕێ ناکەین. یاخود: بیروڕا ئایدۆلۆجیە خوارو خێچەکانی ئەم نووسەرە تەنها ڕێگەی ئەم جۆرە نووسینەی پێ دەدەن... بەڵام ڕیپۆرتاژێکی ڕۆژنامەگەری سەرنجی ڕاکێشام:

لەو ڕیپۆرتاژەدا چەند وەلامێکی سەیری کەسانێکی نائاسایم خوێندەوە، یان بە گوێرەی وەلامەکانیان دەبێ ئەو کەسانە ئاسایی نەبن...چونکە ئەو ڕیپۆرتاژە ئاماژەیەکی غەمناکە لەسەر ئاستی ڕۆشنبیری لای خۆمان، لەلایەکەوە وەلامەکان ئەوەیان دووپات دەکردەوە کە ( لە ئێستادا عالمانیەت بەقۆناغێکی ترسناکدا تێدەپەڕێت ) کەچی لەلایەکی ترەوە ئەوەیان دووپات دەکردەوە کە لەناو کۆمەڵگاکەماندا خورافات و ئەفسانە بڵاو دەبێتەوە و ئەم ئەفسانەیەش لەناو ئاینی ئیسلامدا بوونی نی یە. چەند نموونەیەکیشیان کردبووە شایەتی قسەکانیان تاکو خوێنەر دڵنیابێت و لەداخ ئەو ئاستی بیرکردنەوە کۆنەپەرستانەیەدا هەناسە هەڵکێشێ کە ئێستا تەشەنەی کردووە.

بەڕاستی سەرم لەم ڕیپۆرتاژانە سووڕما و لەدڵی خۆمدا وتم:

مادەم ئێوە دەم لە عالمانیەت دەکوتن و باسی دەکەن، دەبێ لەبیریشتان نەچێ کە لەژێر سایەی عالمانیەتدا مرۆڤ دەتوانێ ئیمانی بە ئەفسانە لەدینی ئیسلامدا و بگرە نزمتر لە ئەفسانەیش هەبێ. هیچ دەوڵەتێکیش ناتوانێ دەست وەرداتە ئەم کارانەوە. بەڵام

ئەوانەی کە ئیمانیان بەو ئەفسانەیە هەیە ئەگەر ویستیان خۆیان ڕێك بخەن بۆ گۆڕینی سیستەمی حوکم بە بەکارهێنانی هێزو تەقەمەنیو، سیستەمێکی حوکمیان لەسەر ئەو ئەفسانەیە دامەزراند، ئا ئەو کاتە دەوڵەت بۆی هەیە و دەتوانێ دەست وەرداتە کاریانو ڕێیان لێ بگرێت.

خۆ ئاشکرایە ئەو بیروباوەڕانەش کە ئەوان ناویان لێ نابوون ( ئەفسانە) تەنها لەبەرئەوەی بەگوێرەی فەرهەنگو ئیجتیهادی شەخسیو قەناعەتی شەخسی ئەوان ئەفسانەیە. خۆ ئەگەر ئەوانە ئەفسانە بوونایەو لەناو ئیسلامدا جێگەیان نەبوایەتەوە ئەوا ئیسلام بە ئەرکی خۆی دەزانی کە ڕەتیان بکاتەوەو ئەو ئەرکەیشی دەخستە ئەستۆی زاناکانمانەوە. چونکە ئەوکات دەبوو زاناکانمان ڕاپەڕن و بڵێن: " ئاینی ئیسلام لەمەترسیدایە، ئەوەتا لەهەموو لایەکەوە ئەفسانە دەورەی لێداوین" ئەگەر ئەمە بڵێن ئەوە مافی خۆیانە. بەڵام ئەگەر لەلایەکەوە باسی عالمانیەت بکەین و لەلایەکی تریشەوە لە دەست بڵاوبوونەوەی ئەفسانەیەکی پێچەوانەی ئیسلام سکاڵا بکەین، دیارە ئەمە لۆژیك و باسێکەو تێگەیشتنی زۆر دژوارە.

ڕاستیەکەی ئەم پرسیارانەش ئەوەندە ئاسان نین کە هەموو کەسێك بێ ورد بوونەوەو شارەزایی لە بارەیانەوە بنووسێ:

تەنیا ماف ناسان و پسپۆڕانی یاسا دەتوانن ڕای خۆیان دەربڕن، ئاخۆ پۆشینی بەرگی بالاپۆشی دەکرێ لە ڕیزی چەمکی

(عەلمانیەت) دا باس بکرێت یان لەگەڵ چەمکی ( ئازادی ئاینی و ئازادی بیروباوەڕی تاك) دا.

پێویستە ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەو گفتوگۆیە بەشێوەیەکی بێ لایەنانەو دوور لە هەموو بیروڕا سەرپێی و کەسیەکان بێت و نابێ فلانە نەتەوەو فیسارە میللەت بکرێنە نموونەو پێوەر بۆ ئێمە، بەڵکو پشت ببەستێت بە زانیاری و شارەزایی ڕاستەقینە بە ڕۆڵەکانی ئەم نەتەوەیە.

پێویستە ئەم گفتوگۆ و وتو وێژە لەچوارچێوەی ویقار و هەستی ئازادی ئەم نەتەوەدا بکرێت نەك بکرێتە ژێر چەپۆك و داگیرکراوی کەلتورو ڕۆشنبیری هەر نەتەوەیەکی تر..ئێمەش لەم ڕۆژگارەدا زۆر بەتاسەوە چاوەڕێی هاتنی ئەو ڕۆژە دەکەین، بەلام خۆمان پێ ناگیرێ و ئەم ڕاستیە تاڵ و سوێرانە تۆمار دەکەین.

بابەتی پۆشاك و بالاپۆشی زیاتر لە ناوەندە ئایدۆلۆجی و فکریەکاندا دەوروژێنرێت، وەك لەوەی لە ناوەندە یاسایی و مافناسیەکاندا بوروژێنرێت. زیاتریش لەو گۆڤارو ڕۆژنامانەدا بە مانشێتی گەورە دەنووسرێت کە تەرخان کراون بۆ وروژاندنی ئارەزووی سێکسی لاوان...

پاش ئەم لێکدانەوە کورتەی (نەنگی) و (گوناه )، دەڕۆمە لای بوارە ئاینیەکەی بالاپۆشی و هەندێ قسە بۆ ئەو "خزم"ەت دەکەم

کە ئەوەندە خۆی بە بوێر زانیوەو فەتوای شەرعیی بە سەرپێی و بێ زانیاری فڕێ داون.

بۆچوونی خزمەکەت دەبێت بە دوو بەشەوە:

یەکەمیان ڕەخنەکەی: ( بۆچی جلوبەرگی ئێستامان – ئەگەر جەستەشمان دەر بکەوێت گوناهبارییە؟ ) دووەمیان: بریتییە لە قەناعەتی خودی خۆی بەوەی کە لە ئیسلامدا باسی بالاپۆشی و خۆداپۆشین نەکراوە؟ ئەگەرچی هەردوو بەشەکەی جیاوازیەکی ئەوتۆیان پێوە دیار نییە، بەڵام هەریەکەیان بۆخۆی بابەتێکی سەربەخۆیە. بۆیە بەجیا وەڵامی هەردووکیان دەدەمەوە.

لەیلا خان باش گوێم لێ بگرە! ئەوە چەندین ساڵە مشتومڕ لەبارەی چەندەها باس و خواسی جیاجیاوە دەبیستم، لەبارەی چەندەها بابەتەوە چەندین پرسیار و داوای ڕوونکردنەوەم لێ کراوە، خۆیشم ئامادەی چەندین کۆڕی مشتومڕ بووم. کۆی دەرەنجامی گشتی کە لەو مشت ومڕانەوە دەرم هێناوە بەم جۆرە باسیان دەکەم.

تا ئێستاکە بازرگانێکم نەدیوە کە دوور بێت لە سوو (ریبا) و مامەڵەی پێوە نەکات، بپرسێ: " بۆچی سوو بەحەرام دەژمێررێ؟ " کەسیشم نەدیوە بەردەوام بێت لەسەر نوێژکردن و بڵێ: "جا کێ وتویەتی ئێمە بە نوێژکردن دەبینە موسوڵمان؟ دڵ حیسابە، گرنگ ئەوەیە تەماشای دڵم بکەی."

سـەبارەت بـە جلوبـەرگی ئیسـلامیانەش هـەر هـەمان شـت لـە ئارادایە، ئەگەر باش ورد بیتەوە لـە ڕەفتـاری کەسـێك کـە دەڵـێ: " بالاپۆشی چ بایەخێکی هەیە؟ خۆ مرۆڤ دەتوانێ لەناو ئەو بەرگەیشدا هەموو کارێ بکات." دەبینی هەریەکە لەو کەسـانە بەباشـی ئیسـلام ناناسـێت یـان هـیچ پایەیـەك لـە پایـەکانی ئیسـلام ئـەنجام نـادات و فەرمانەکانی جێ بەجێ ناکات.

ئەمانە بۆ ڕزگاربوون لە گرێو گۆلی ئەو گوناهبارییەی کـە لـەناخی دەروونیاندا هەیە، ئەم جۆرە ڕەخنەو توانجانە دێننە ئـاراوە. لـەبری ئەوەی هەڵسنە سەرپێ و تەقە بدەن لە دەرگای تەوبەکردن، کەچـی هەوڵی ئەوە دەدەن بیسەلمێنن کە گوناهەکانیان شەرعین و هیچ تۆز و تەمو مژێکیان بەسەرەوە نیە. وەك ئەوەی بڵێی کـاتێ کـە هـەوڵی قەناعەت پێکردنـی کەسـانی تـر دەدەن خۆیـان لـەو بەرپرسـیارێتیە ڕزگار دەکەن. کەچی هەرچی شتێکیش کە گوناه و حـەرام بـوو ئـەوا حەرامـە، ئەگـەر حـەلاڵیش بـوو ئـەوە حەلاڵـە، هـەرگیز ( زۆرینـە) ناتوانێ خۆی حەلاڵ و حەرام دیاری بکات.

جا ئەگەر بالاپۆشی واتە بـەرگی ئیسـلامی لـەناو دینـی ئیسـلامدا هەبێ، ئەوا هەیـە و کەسـیش نـاتوانێ - هەرکەسـێك بێـت - نکـۆڵی لەوە بکات. هەروەها کەسیش ناتوانێ لەو بارەیەوە زۆر لە خـەڵکانی تر بکات.

من تەنها یەك داوام لەو خزمەی تۆ هەیە، با بەبێ لایەنانەو لای کەم وەك ئاستی توێژینەوەکانی ناموسوڵمانەکان لێکۆڵینەوەی ئیسلام بکات. تا ئەو کاتە پێگەی ڕاستەقینەی بالآپۆشی لە ئایینـدا بۆ ڕوون دەبێتەوە. ئیتر ئەو کاتـە بەدەستی خۆیـەتی و ئـازادە کـە لەم بابەتەدا شوێن فـەرمانی ئیسلام دەکـەوێ یـان ناکـەوێ. ئـەوە کارێکەو بەندە بەخۆیەوە. بەڵام ئەگـەر لـەدینی ئیسلامدا حیجاب و پۆشتەیی هەبوو دەبـێ چاك لـەوە دڵنیابێـت کـە ئەگـەر شـوێن ئـەو فەرمانەی ئیسلام نەکەوێت ئـەوە گوناهبـار دەبێـت...دەبێـت بـڕوای بەوە هەبێت تاکو ڕۆژێك لە ڕۆژان دەستی بگاتە دەرگای تەوبەکردن.

ئێستاش دەمەوێ بچمە سەر بابەتێکی گرنگ:

ئەوانەی کە هەمیشە ڕەخنە دەگرن و دەڵێن: " بۆچـی ئـەوە بـە حەرام دەژمێررێ؟". یان "بۆچی ئەمە گوناهە؟ "ئەوانە هێشتا ئـەم حوکمەی خوارەوە نازانن: هۆکاری بوونی عیبادەتەکان لە ئیسلام دا بریتیە لە فەرمانـەکانی خواوەنـد، حـەرامیش بریتیـە لـە نەهیـەکانی خواوەنـد. واتـە: بۆیـە عیبادەتـەکان ئـەنجام دەدەیـن چـونکە خـوا فـەرمانی بـەوە کـردووە، بۆیـە لـە گوناهـەکانیش دوور دەکەوینـەوە چونکە خودا نەهی لەوە کردووە.

لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا خـودای میهرەبـان لـەم دنیایـەدا هەنـدێ سوودو قازانج دەکاتە بەشی ئەو کەسانەی شـوێن فەرمانـەکانی ئـەو

دەکەون، هەندێ زیانیش دەدات لەوانەی لەو گوناهانەوە دەگلێن، وەك سوودەکانی ڕۆژوو و زیانەکانی مەی.

بەڵام دیارە ڕۆژوو لەبەرخاتری سوودەکانی ناگیرێت و شەرابیش لەبەر زیانەکانی لێی بە دوور نابین. خۆ ئەگەر ڕۆژوو هیچ سوودێکی پزیشکی نەبێ ئیماندارەکان هەر بە ڕۆژوو دەبن. ئەگەر (مەی)ش هیچ زیانێکی نەبێ هەرگیز ئیمانداران توخنی ناکەون.

نموونەیەکی ترت بۆ دێنمەوە: وەك دەزانی گۆشتی مردارەوە بوو حەرامە چ بەرخ بێت یان مانگا...هتد. دەتوانین چەندین بەڵگەو ڕێنومایی پزیشکی و بایۆلۆجی بهێنینەوە لەسەر ئەمە. بەڵام ئەم بەڵگەو ڕێنومایانە تەنها دەڕژێنە ناو بابەتی (حیکمەتەوە).

لەکاتی ژماردنی ئەو هۆکارانەدا بیریان دەچێت وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە... زۆرباشە کەواتە بۆچی هەر ئاژەڵێکیش لەکاتی سەربڕیندا ناوی خودای لەسەر نەبرابێ حەرامە گۆشتەکەی بخۆین؟

وەڵامیان بۆ ئەو پرسیارە چییە؟ خۆ ئەو ئاژەڵە سەری بڕاوە و خوێنی ڕژاوە...کەواتە بناغەو مەبەستی باسەکە بریتی نیە لەسوودە پزیشکیەکانی ئەو سەربڕینە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی لەو هەستە دانەماڵێت کە بەندەیەکی خودایەو پێویستە لەسەری شوێن ئەو ڕەفتارانە بکەوێت کە خودا لێیان ڕازیە... جا ئەگەر هەرچی سەربڕی بەناوی خوداوە سەری دەبڕێ، ئەگەر بەرگێکی پۆشی بەناوی ئەوەوە دەیپۆشێ و هەرگیز لەبیری ناچێتەوە کە بەندەی

خودایە. واتە ئەرکی سەرشانیەتی کە بەردەوام فەرمان و نەهیەکانی خواوەندی لەپێش چاو بن.

ئەم دێڕانە بۆ خزمەکەت بخوێنەرەوە و بە شێوازێکی ئاسان و گونجاویش لەمەی خوارەوە ئاگاداری بکەرەوە: کردنی هەر گوناهێك شتێکەو، بەگوناه نەزانینی ئەو کارە شتێکی ترە و دوو شتی جیاوازن، چونکە دووەمیان دەبێتە مایەی بەردەوام بوونی گوناه کردن. بۆیە زۆر لەیەکەمیان مەترسیدارترە.

بەڵام ئەگەر بێینە سەر باسی ئەوەی حیجاب لە ئیسلامدا هەیە یان نیە، دیارە من دەتوانم فەتوای گەورە زانایانی ئیسلامی بۆ بهێنم. بەڵام بەهۆی ئەوەی کە هەندێ لە موسوڵمانە هاوچەرخەکانمان شارەزای پێگەی فەتوا نین لە ئاینی ئیسلامدا، ئەوا ڕاستەوخۆ ئایەتەکانی قورئان و تەفسیرەکەیانت بۆ دێنم.

لە سورەتی (نوور)دا خودا بە پێغەمبەری خۆی ﷺ دەفەرموێت:
﴿ قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ * وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ وَلا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوْ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُوْلِي الإِرْبَةِ مِنْ الرِّجَالِ أَوْ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَاءِ وَلا يَضْرِبْنَ

بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِنْ زِينَتِهِنَّ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعاً أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾ النور:٣٠-٣١.

ئەگەر ئەم ئایەتە پیرۆزانە بە وردیو بایەخەوە بخوێنینەوە ئەوا کۆمەڵێك ڕاستیمان بۆ دەردەکەوێت:

ڕاستی یەکەمیان: ڕووی دەمی وتار لە سەرجەمی ژنە ئیماندارەکانە، واتە خۆ داپۆشین نیشانەیەکە لە نیشانەکانی ئیمان و لە ژنە ئیماندارەکان داواکراوە.

ئاشکرایە داوا ناکرێت لە کەسێکی ناموسوڵمان پابەند بێت بە ئەمرو نەهیەکانی ئیسلامەوە. واتە یەکەمین هەنگاو بریتیە لەوە کەسەکە باوەڕ بهێنێت بە خودایەکی پەروەردگار و پاشان بە پێغەمبەرایەتی محەممەدﷺ کە ڕەوانەکراو و دوایین پێغەمبەری خودایە، هەروا بڕوا بەوە بهێنێت کە قورئانی پیرۆزیش فەرمایشتی خودای تەعالایە... هەرکاتێ ئەم بڕوایەی هەبوو ئەوکات داواشی لێ دەکرێ کە فەرمانەکانی خودا بەجێ بهێنێتو لە نەهیەکانی دوور کەوێتەوە. واتە دەزانێ کە بەندەی خودایەو کەسێکی بێ خاوەن نییە کە بەری بۆ شل کرابێت و بەرەڵڵا بێت.

ڕاستی دووەم: سەیر نەکردنو چاو لادان لەئاستی نامەحرەم تەنها لەپیاوان داوا نەکراوە، بەڵکو لە ژنانیش داواکراوە.

ڕاستی سێهەم: دەرنەخستنی جوانیەکان.

یەکێك لە تەفسیرەکان سەبارەت بە وشەی (الزینة) ی ئایەتە پیرۆزەکە دەفەرموێ:

ئەگەرچی مەبەست لە (الزینة) کەرەستەکانی جوانکاریە، بەڵام لێرەدا مەبەستی ئەو جێگایانەیە کە ئەو کەرەستانەی پێدا دەکرێن وەك: گوێ، گەردن، مەچەك... چونکە پێ ناچێ ئەو نەهیە تەنها سەیرکردنی ئەو کەرەستانە بگرێتەوە. مەبەستی سەرەکی ئایەتەکەیش بریتیە لە بالآپۆشی، ڕووی وتاریشی دەکاتە ئیماندارەکان بەهەژارو دەوڵەمەندیانەوە، ئەوا ئەگەر مەبەستی وتارەکە تەنها خشڵ و ئامێرەکانی خۆ ڕازاندنەوە بوایە وتارەکە تەنها ڕوو لە ژنە دەوڵەمەندەکان دەبوو، بەڵام لێرەدا وتارەکە گشتییە بۆ هەمووان، چونکە بە شێوازی (وقُلْ لِلْمُؤْمِنات..) هاتووە. شتێکی تری گرنگیش: جوانیو ڕازاندنەوەی سەرەکی لە ژندا تەنها بە خشڵ و ئامرازەکانی جوانکاری نابێ، بەڵکو ئەندامەکانیشی دەگرێتەوە. کەواتە حەرام بریتیە لە دەرخستنی ئەندامەکانی وەك گەردن و سنگ و باڵ، کە بۆ خۆیان بریتین لە جوانیەکانی ژن.

ڕاستی چوارەم: بە پێچەوانەی ژنانی سەردەمی نەفامیەوە کە لەچکەکانیان لە پشتی سەریانەوە توند دەکرد و گەردنیان دەردەکەوت، خودای گەورە فەرمان بە ژنە ئیماندارەکان دەکات کە لەچك بدەن بەسەریانداو لە پێشەوە بیبەستنو سنگو گەردنیان دەرنەکەوێت.

دوای ئەوە ئایەتەکە بەڕێز ناوی ئەو کەسانە دەهێنێت کە ئافرەت بۆی هەیە جوانیەکانی خۆی بۆیان دەربخات و لێیان نەشارێتەوە. لەڕیزی ئەوانەشدا (أو نِسائِهِنَّ) هاتووە کە ژنە ناسراوەکان یان برادەرەکانیان یان ئەو ژنانەن کە خزمەتیان دەکەن و لای ئەوان کاردەکەن. هەندێ لە زانایانیش دەڵێن مەبەست لەو ژنانە ژنە موسوڵمانەکانن. تەفسیری یەکەم دەڵێ: دروست نییە ژنی ئیماندار جوانیەکانی و شوێنە سەرنج ڕاکێشەکانی خۆی بۆ غەیری هاوەڵ و نزیکەکانی خۆی دەربخات.

تەفسیری دووەمیش دەڵێ: دروستە بۆ ژنە موسوڵمانەکانی دەربخات و بەڵام دروست نییە کە بۆ ژنە ناموسوڵمانەکانی دەربخات.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلابِيبِهِنَّ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَحِيماً ﴾ الأحزاب:٥٩.

لەم ئایەتە پیرۆزەشدا دیسان بە ڕوون و ئاشکرایی فەرمان دراوە بە خۆداپۆشین، ئایەتەکەش دانایی و کەڵکی ئەو فەرمانە دەردەخات و دەفەرموێ: ﴿ ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلا يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَحِيماً﴾ واتە تا ژنە ئیماندارەکان لە ژنە ناپاکەکان جیاببنەوە و بۆ ئەوەی ئازار نەدرێن و دووچاری هیچ توانج و پلار و تەنگ پێ هەڵچنینێك نەبن، بەشی کۆتایی ئایەتە پیرۆزەکە دەفەرموێ: ﴿وَكَانَ

اللهُ غَفُوراً رَحِيماً﴾ چەندەها واتا و بەڵگە هەڵدەگرێت، یەکێ لە تەفسیرەکان دەفەرموێ:

ئەم ئایەتە ئاماژە بۆ ئەم واتایانەی خوارەوە دەکات:

١- لێبوردنی خوای گەورەیە، ئەوەتا لەوە خۆش بووە کە پێشتر پابەند نەبووبێ بە جلوبەرگی بالاّ پۆشییەوە، هەروەها نەنگ و عەیبەکان دەپۆشێ، چونکە ڕەحمەتی زۆر فراوانە.

٢- لەبەرئەوەی کە خوا لێبوردەو میهرەبانە، هەرگیز ڕازی نیە کە هیچ ئازارێك ئاڕاستەی ژنان بکرێت، هەر بۆیە فەرمانیان پێ دەکات خۆیان داپۆشن.

پاش فەرزکردنی بالاّپۆشی پێویستە چیتر زیاد لە پێویست تەنگ بەژن هەڵنەچنرێتو زیادەڕۆیی لەگەڵدا نەکرێ، چونکە خودا لێبوردەو دلۆڤان و میهرەبانە، خودا کە فەرمانی بالاّپۆشی داوە بۆ بەرژەوەندی ئەوانە نەك بۆ زیان پێگەیاندنیان.

پێش کۆتایی هێنان بەم باسە بەباشی دەزانم ئاماژە بەم وتەیەی خوارەوەش بکەم:

خۆداپۆشین شتێکی سروشتیە بۆ مرۆڤ، چونکە تەنانەت لەو کۆمەڵگایانەشدا کە دژی ئاینن نابینین خەڵك بە ڕووتی بەشەقامەکاندا بسوڕێنەوە، هەروەها نابینین کە فەرمانبەران لە فەرمانگەکانیاندا بە ڕووتی فەرمانەکانی خۆیان ڕاپەڕێنن.

کەواتــە هــەرگیز نــاکرێ بــە ڕەهــایی و تاســەر ئێسـقان دژایــەتی بالاپۆشــی بکرێـت، واتــە تــا ئاسـتێکی دیـاریکراو دژایەتی دەکرێـت. هــەموو مشــتومڕەکانیش بــە دەوری ئــەم خاڵــەدا چــڕ دەبنــەوە. هـــەموانیش بـــەگوێرەی داب و نـــەریت و دەوروبـــەر و ســـنووری کۆمەڵایـــەتیان قەناعـــەت و بیروبـــاوەڕو ڕای خۆیـــان لـــەبارەی بالاپۆشییەوە دەردەبڕن.

بڕیارو فەرمانی قورئان لەسەر ئەو بابەتە بگەیەنە بـەو خزمـەت و بە هەر هاوەڵێکی تریشـت کـە وەك ئـەو بـیر دەکاتـەوە، دوای ئـەوە لێیان گەڕێ با بە ئارەزووی خۆیان چی دەکەن بیکەن، چونکە لە ناو دیندا زۆرەملێ و ناچارکردن نییـە، تـۆش ئـەرکت تـەنیا ئەوەیـە کـە پێیان ڕابگەیەنیت و بەس.

من دڵنیام زۆربەی ئەوانەی ڕەخنەت لێدەگرن دژی ئیسـلام نـین. ئەوان ئیمانیان هەیە. بەڵام لە ئیسلام نـامۆن و ئاگایـان لێـی نییـە و دیل و داماوی دەورو بەرو کۆمەڵگاکەیانن، بگرە هەنـدێکیان لـەناخی دڵیانــەوە زۆر بــە تامــەزرۆیی حــەزیان لــە نوێــژکردن و پەرســتنی خودایـە، بـەڵام بـەژنو بـاڵاو قیافـەو جـل و بـەرگ و ئارایشـتەکەیان ڕێیان پێ نادات.

من تووشی زۆرێك لەو کەسانە بووم، خۆ ئەگەر لەناو هاوەڵەکانتدا هەیانبێت بەو جۆرە بیربکاتەوە ئەوا پێم خۆشە کە پێیان بڵێم:

دەسـتبەرداربوونی نوێـژ تـەنها لەبەرئـەوەی کـە پۆشـاکەکانتان موسوڵمانانە نییە کارێکی نالۆژیکیـە، مـن وای دەبیـنم کـە پێویسـتە

لەو جۆرە بیرکردنەوەیە دوور بکەونەوە، بگرە پـێم باشـە ئێـوە بـەم جۆرە بیربکەنەوە: مەرج نیە هەرکەسێ نوێژکـەر نـەبوو ئـەوە بکاتـە بیانوو ڕۆژوویش نەگرێ گوایە نوێژ ناکات. چونکە هەریەك لە نوێـژ و ڕۆژوو فـــەرزی ئیســـلامن، هەریەکـــە لـــەو فەرزانـــەیش فـــەرمانێکی سـەربەخۆو جیـای خواوەنـدن. هەرکـەس یـەکێکیان ئـەنجام بـداتو ئەوی تریان ئەنجام نەدات لـەلای خـوا بەرپرسـیار ئـەبێ لـەوەی کـە نەیکردووە و بەرپرسیار نابێ لەوەی کردوویەتی.

ئەرێ ئێوە سەرمایەدار و خاوەن کاری واتان دیـوە کـە ئـاگر بـەر بداتە سەدان جێگەی کـارە سـوود بەخشـەکانی بـە بیـانووی ئـەوەی تەنها جێگەیەکیان زیانی پێدەگەیەنێت؟

ئەگەر باش وردببنەوە ئەوا جیاوازیـەکی ئـەوتۆ نـابینن لـە نێـوان ئەو کـارەی خۆتـان و کـاری سـەرمایەدارەکەدا. ئێـوە دەکەونـە نـاو فێڵێکی چەپەڵی دەروونەوە. بۆ پووچەڵکردنەوەی ئەو فێڵە پێویستە یادی مردنو ڕۆژی زیندوبوونەوە بکەن، چـونکە هـەموو کردەوەیـەك لە کردەوەکان بەجیا کێشانە دەکرێت. کەواتە، تا دەتوانن کاربکـەن و ئەرکی بەندایەتی بۆ خودا بەجێ بهێنن، هەر کارێکیش کە ئێستاکە ناتوانن ئەنجامی بدەن با دڵتان هەمیشە بە تاسەو ئومێـدو پـەژارەی ئەنجامدانیـەوە بـژی، چـونکە بـە کۆمـەکی خـودا هـەر ڕۆژێـك دێتـە پێشەوە کە ئەو کارەیش ئەنجام بدەن.

سەبارەت بەو هاوەڵەیشت کە وتبووی: لـەپای چـی جـوانی خـۆم بشارمەوە؟ تکات لێ دەکەم لێی بپرسە: " ئەی لە سایەی کێ یە تـۆ

جوانی؟ ئایا دەزانی تۆ کالاّ و شمەکی کێ هەراج دەکەیت و بە ئامادەیی کێ دەیفرۆشیت و بەکێی دەفرۆشی؟ "پاش ئەوە ئەو فەرمودە پیرۆزەی بۆ بخوێنەرەوە کە پێغەمبەر ﷺ سەری لە پێنج شت سوڕ دەمێنێت و یەکێکیان ئەمەیە:

لە کەسێك کە لە خۆی بایی ببێ لە کاتێکدا دەزانێ لە دلۆپێك ئاو دروستکراوە و دواییش دەبێتەوە بەلاشەیەکی بێ گیان؟ پاشان ئەم ئایەتە پیرۆزەیشی بۆ بخوێنەرەوە:﴿ وَلا تَمْشِ فِي الأَرْضِ مَرَحاً إِنَّكَ لَنْ تَخْرِقَ الأَرْضَ وَلَنْ تَبْلُغَ الْجِبَالَ طُولاً﴾ الإسراء:٣٧.

پاشان پێی بڵێ: ئەگەر دەرزیەك بەهەر جێگیەکی جەستەتدا بچەقێنی خوێن لەو جێگەیە دێتە دەرەوە، واتە جەستەت کەمۆڵەیەکی خوێنەو لە ناوەوەیدا پڕە لە دەمار و ئێسقان‌و ڕیخۆڵە... لە پێستدا توێژێکی تەنك هەیە و هەموو ئەو ئەندامانەی داپۆشیوە و ئەوەت بۆ مسۆگەر دەکات کە بەجوانیەوە دەرکەویت و بەفیز و نازەوە بڕۆی بەڕێوە...ئا بەم جۆرە سوپاسگوزاری خۆت دەردەبڕی بەرامبەر بەو خەڵات و بەخششانەی کە بەسەرتدا ڕژاون؟

ئەگەر خودا مەیلی بکردایە مرۆڤیشی وەك ئاژەڵان لێدەکرد و بەرگێکی خۆڕسك و سروشتی دەکردە بەری و فەرمانی خۆداپۆشینی پێ نەدەکرد، بەڵام دەیەوێ ئادەمیزادەکان لە بابەتی جلوبەرگ و خۆداپۆشیندا تاقی بکاتەوە..ئەمە بەباشی بزانەو دیسان و پاشان بە ئارەزووی خۆت بڕیاری خۆت بدە.

ئەو هاوەڵەیشت کە مامۆستای کیمیایە و پێی وتبوی: مـن ئـازادم بە ئارەزووی خۆم جل لەبەر دەکەم، سەلامی منی پێ بگەیەنەو پێی بڵێ:

" ئەوکاتـەی لـە قوتابخانـەی سـەرەتایی‌دا قوتـابی بوویـت چـۆن چەمکی "ئازادی"یان بۆ پێناسە کردووی؟ " بێگومان ئەوەی لەبیرە کە سنوری ئازادی لە سنوری ئازادی کەسانی تـردا کۆتـایی پـێ دێ، واتە مرۆڤ لەوەدا ئازاد نییە کە ئازاری کەسانی تر بدات.

ئیسـلام چوارچـێوەیەکی فـراوانتر و گشـگیرتر بـۆ ئـەم بابەتـە دەکێشێ. مرۆڤ لە ئیسـلامدا تەنانـەت لـە ئـازاردانی خۆیشـیدا ئـازاد نییە، هەریەکە لە جەستەو مێشك و ڕۆح سپاردەن لەگـەردنی مرۆڤـدا و ڕێی پێ نەدراوە کە ناپاکی لـەو سـپاردانە بکـات و، ئـازاد نیـە کـە خۆی بکوژێت. چـونکە گیـانی خـۆی مـوڵکی خـۆی نییـە. نـەك خـۆ کوشـتن، بگـرە تەنانـەت لەوەشـدا ئـازاد نییـە کـە پەنجەیـەك لـە پەنجەکانی خۆی ببڕێتەوە، ئـازاد نییـە کـە مـەی بخواتـەوەو مـاددە بێهۆشـکەرەکان بـەکاربهێنێ چـونکە خـۆی عـەقڵی خـۆی دروسـت نەکردووە.

مـادام تـۆ بەنـدەی خودایـتو یـەکێکی لـە شـوێنەوارەکانیو دروستکراو و بەدیهاتووی کارخانەکەی ئەوی، مادام تۆ نیت کـە ئـەم گۆی زەمینـە بـەڕێوە دەبـەیت، یـان وەرزی بـەهار بهێنـی یـان خـۆر دابگیرسێنی...کەواتـە لەوەشـدا ئـازاد نیـت کـە لـە ڕۆژێکـی بـەهاردا

بەئارەزووی خۆت جلو بەرگت لەبەر بکەیتو دابەزیتە ناو شەقامو بازاڕەوە بۆ ئەوەی ئارەزوو مەیلی کەسانی تر بوروژێنیت و ببزوێنیت...هەرگیز لەمەدا ئازاد نیت، هەروەك لەوەدا ئازاد نیت سەرپێچی فەرمانەکانی خودا بکەیت، هەروەها ئازادی و مافی ئەوەشت پێ نیە کەسانی تر دووچاری گوناح بکەیت و هەستو ڕۆحیان بریندار بکەیت و بیرو خەیاڵیان تێك بدەیت و سەریان لێ تێك بدەیت.

با بەم یاسا گشتیە ئاشنات بکەم کە دەڵێ: "هۆکار وەك بکەر وایە"

ئەم یاسا کورتە بەسەر هەموو کردار و بیرو فکرەکاندا بە چاكو خراپیانەوە دەچەسپێ، چونکە کاتێ مرۆڤ دەزگایەکی خێرخوازی دادەمەزرێنێ، هێندەی هەموو ئەو کارە خێریانەی دەست دەکەوێ کە لەو دەزگایەدا دەکرێن...خۆ سەبارەت بەخراپەش هەر بەو جۆرەیە.

خۆ ئەگەر بمانەوێ زیاتر ڕوونی بکەینەوەو درێژەی پێ بدەین ئەوە دەڵێین: هەر مرۆڤێك کە ببێتە هۆکار و چاوساغ بۆ ڕێنومایی کردنی کەسێکی تر و دۆزینەوەی ڕێبازی حەق، ئەوا ئەو کەسە چەند کاری چاکە دەکات ئەمیش بە هێندەی ئەو پاداشتی دەست دەکەوێ، بێ ئەوەی هیچ لە پاداشتەکەی خۆی کەم بکاتەوە.

هەروەها هەرکەس ببێتە هۆکاری تێکدانو سەرگەردان کردنی هەرکەسێکی تر و لادانی لە ڕێگەی ڕاست، ئەوا ئەو کەسەی کە گرفتاری خراپە دەبێ چەند خراپە بکات هێندەی ئەوە گوناه و ئۆباڵ دەکەوێتە سەر شانی ئەو کەسەی کە خستیە سەر ئەو ڕێگە خراپەیە و هیچ لە گوناه و تاوانی خۆیشی کەم ناکاتەوە.

هەر بۆیە ئەگەر کچێکی لاو هەوڵ بدات سەرنجی کەسانی تر بۆلای خۆی ڕابکێشێت و بە جلو بەرگە تەسكو بریسکەدارەکەی هەواو ئارەزوویان ببزوێنێت، ئەوا دەبێتە هۆکاری ئەوەی سەدان کەس گرفتاری گوناح ببن، بەوەش ئەو کچە خۆی تووشی مەترسیەکی ئێجگار گەورە دەکات.

لەدواییدا وتەیەکی کورتیشم لەگەڵ کچە پورەکەتدا هەیە کە پێی وتبووی، چۆن دەتوانم شوو بەکوڕێك بکەم کە باش نایناسم؟

لەوانەیە نەتوانین لێرەدا وەڵامی تەواوی ئەو قسەیە بدەینەوە، بەڵام بۆئەوەی هیچ بوار بۆ گومانی خراپ نەمێنێتەوە پێویست دەکات ئەو بابەتەیش ڕوون بکەینەوە.

ئایا ئەو ئازادیە تەنها بۆ ژنانە؟ جا ئەگەر لە هەردوولاوە باسی بابەتەکە بکەیت ئەوا زیاتر واقیعی دەبیت، خۆ پیاویش مافی ئەوەی هەیە وەك تۆ بیربکاتەوە، پاش ئەوەی چەندین مانگو بگرە چەندین ساڵ لەگەڵ کچێکی داماوی بەستەزماندا پەیوەندیەکی ناشەرعی دەبەستێ و لەگەڵی ڕادەبوێرێ و خۆی تەسەللا دەکات، دوای ئەوە

بە ئاسانی دەتوانیّ بلّیّ نەخیّر...ئەم کچەم بەدڵ نی یە، دوای ئەوە دەڕوات و لەگەڵ یەکێکی تردا ڕێك دەکەویّو دەست تێکەڵ دەکات.

زۆربەی ئەم پەیوەندیە ناشەرعیانە سەر ناگرن چونکە زۆربەی کوڕە لاوەکان خۆیان واتەنی تەنها بۆ ڕابواردن پەیوەندیان بەستووە و دوایی بۆ هاوسەرگیری دەڕۆن یەکێکی تر داوا دەکەن، چونکە وەك خۆیان دەڵێن متمانەیان بەو جۆرە کچانە نامێنیّ کە بەو جۆرە پەیوەندی لەگەڵ کوڕدا دەبەستن.

زۆرجار ئەم گفتارانە بیّ بیرکردنەوە لەسەرچاوەیەکی عاتیفیەوە دەردەچن. مادام خودا پەروەردگاری مرۆڤەو هەرخۆیشی ئەم بوونەوەرە بەرفراوانەی بەدی هێناوە و خستویەتیە خزمەتو فەرمانی ئەم مرۆڤەوە، هەروا ئەو خودایە وای لەم مرۆڤە کردووە لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی تر هەر لە سکی دایکیەوە تا دەبێتە مرۆڤێکی کامڵ و ڕێك و پێك لە گەشەیەکی بەردەوامدا بێت، کەواتە تەنها مافی ئەو خودایەیە کە ئەو یاسا و ڕێسایانە دابنیّ بۆ مرۆڤ کە لەم دنیادا بەختەوەری دەکەن و لە بەدبەختی و چارەڕەشی ئەو دنیاش دووری دەخەنەوە..

ئیسلام ڕێی داوە بە پیاو و ژن هاوسەری ژیانی خۆیان ببینن، ئەگەر پێویستی کرد کچ وکوڕی لاو بۆیان هەیە بە ئامادەبوونی مەحرەمێك پێکەوە دابنیشن وگفتوگۆ بکەن. بەلاّم هەرگیز ڕێیان پێنەدراوە کە بە تەنیا بن، چونکە نابیّ هەرگیز ئەم دەروونە

بەدخوازانە کە هەستێکی بە کوڵیان هەیە هەروا بەتەنیا بەجێ بهێڵرێن و بەریان بۆ شل بکرێت، کورد واتەنی وەك ئاگر و پووشن.

ئەوەتا پێغەمبەر لەو بارەیەوە ﷺ دەفەرموێت:" ئەگەر ژنێك و پیاوێك بە تەنها خۆیان دوو بەدوو بوون، ئەوا شەیتان سێ یەمیانە"

ئیسلام لەبارەی دنیاوە دەڵێ " دنیا گاڵتەو گەپ و یاری یە" بەلام لەبارەی ڕۆژی دواییەوە دەڵێ: "باشترەو مانەوەیش مسۆگەرە" بۆیە پێی وایە باشترین پێوەر بۆ هاوسەرگیری بریتی یە لە ئاین و ڕەوشت و پاکداوێنی..

پێغەمبەرمان ﷺ کە هاتنی بووە بەڕەحمەت و فەڕو بەرەکەت بۆ جیهانیان، دەفەرموێ: " ئافرەت لەبەر چوارشت دەخوازرێ: لەبەر جوانیەکەی، لەبەر سامانەکەی، لەبەر خانەوادەکەی، لەبەر ئاینەکەی، تۆ ئەو ئافرەتە بخوازە کە دیندارە، بەوە دەستت دەچێت بەناو خێر و خۆشیدا."

منیش هیوادارم کە تۆ وانەیەك لەو فەرموودە شیرینەوە وەربگریت و لە ڕیزی چوارەمیاندا بیت بۆ ئەوەی لە هاوسەرگیریدا بگەیتە ئەو بەختەوەریەی کە ئاواتی بۆ دەخوازی. وێڕای ئەوانەش هێشتا ئەگەر بتەوێ: فەرموو لە هەموو بوارێکەوە لێکۆڵینەوە بکە لەو کەسەی کە دەبێتە هاوسەری دوارۆژت. بەلام با یەکەمین داواکاریت ئەوەبێ کە هاوسەرەکەت خاوەنی ئاین و ڕەوشتی بەرز بێت، مەبەستم لە ڕەوشت ئەوە نیە کە ئەو پیاوە داماو و دەستەمۆ

بێت و له هەمووشتێکدا بێ هیچ قەیدو شەرتێ بە گوێی ژنەکەی بکات.

خۆ ئەگەر بتەوێ چاوت پێی بکەوێ هیچ خراپەیەك لەوەدا نیە، بەڵام دەبێت ئەوەت لەبیر نەچێت جەستە بەرگی ڕۆحە، واتە کاتێك سەیری دەکەیت تەنها بەرگی دەرەوەی دەبینی چونکە ناتوانیت وردەکاریەکانی ڕۆحی ببینێت مەگەر دوای هاوسەرگیری، دەخیل نەکەی بە ڕووکەش‌و قسەی شیرین‌و بەڵێنی تەفرەدەرانەی پێش هاوسەرگیریی بخەڵەتێیت.

هیوادارم کە هەرگیز ئەوەت لە باد نەچێ کە بەختەوەری تەنها لە یەك ڕووەوە نییە، بەڵکو چەندین ڕووی هەیە، ئەگەر بتەوێ بگەیت بە هەموو ڕووەکانی ئەوا خۆت شەکەت و ماندوو دەکەیت.

با بۆت ڕوون بکەمەوە:

گریمان تۆ پیاوێکت بەدڵ بوو و خێزانتان پێك هێنا، ئایا ئەتوانی وەڵامی ئەم پرسیارانەم بدەیتەوە:

- ئایا لەم مێردە خوا منداڵت پێ دەبەخشێت؟
- ئایا منداڵەکان بە لەش ساغی یان بەنەخۆشی لە دایك دەبن؟
- ئایا دەکرێ بزانیت لە داهاتوودا کارەساتێك تووش دەبێت، یان تووشی پیاوەکەت دەبێت؟ ئەوە کەی دەبێت؟
- تۆ بڵێی بەڵاو کارەساتێکی وا لە داهاتوودا بقەومێ کە تۆ بێوە ژن بخات و منداڵەکانت هەتیو بکەون؟

- خۆت چەند ساڵ دەژیت؟ ئەی مێردەکەت؟ ئەگەر مێردەکەت پێش تۆ مرد تەقە لە چ دەرگایەك دەدەیت و هانا بۆ کێ دەبەیت؟

- ئەبێ منداڵەکانت چاك بن یان خراپ؟

- بەگوێرەی ئەو پەندەیش کە دەڵێ: " هەرچی بچێنی ئەوە دەدوورێتەوە" ئایا ئەو هەڵەو خراپانەی لە تافی لاویدا کردووتن لە منداڵەکانیشتدا ڕەنگ دەدەنەوە؟

ئەگەر لەسەر ئەم جۆرە پرسیاران بەردەوام بین ئەوا پەڕاوێك پڕدەکەینەوە.. بمانەوێ و نەمانەوێ تەنیا لەم جۆرە پرسیارانەدا پەنا دەبەینە بەرخودا و داوای کۆمەکی و هانا و سۆز و چاکەی ئەو دەکەین.

کەواتە، ئایا وا باشتر نییە کە هەر لەسەرەتاوە هێلانەکەمان لەسەربناغەی ڕەزامەندی خودا دابمەزرێنن و پاشتر لەم جۆرە پرسیارانەدا پشت و پەنامان هەر بەخودا ببەستین؟

ئەگەر تۆ وابکەیت ئەوا بەو چاوەوە سەیری ئەو کۆسپو گرفتانە دەکەیت کە لە داهاتوودا دێنە ڕێت کە تاقیکردنەوەی خوداین نەك بەو چاوەوە کە سزا و تۆڵەی خودابن بۆت، ئیدی وایان لێ رادەبینی کە دەبنە هۆکاری بەرز بوونەوەو ئەزموونو ڕاهێنان لەسەر ئارامگرتن... جا ئەگەر گەیشتیت بەم فام و تێگەیشتنە ئەوا هەموو دنیا ناتوانن لەرزەت پێ بکەن و سەغڵەتت بکەن. هەروا ڕووداو و پێشهاتەکانیش ناتوانن زیانت پێبگەیەنن و، هەرگیز لە ناو پەژارەو

دڵتەنگی و ناسۆردا نقوم نابی، بەڵکو بەو ڕۆحە بەهێزەتەوە ژیانێکی پڕ لەبەختەوەری دەژیت.

بەڵێ لەیلا !.. لەوە دەچێ بەهۆی ئەوەی لەم نامەیەی دواییتدا کە هیچ پرسیارێکی تایبەت بە خۆتت نەکردبوو، منیش لەم نامەیەدا زیاتر لەگەڵ کەسانی تردا قسەم کردبێ تاکو تۆ، ئومێدم وایە کە ئەمە خێرو سوودی تێدا بێت.

والسلام...

***** ****** *****

ئەمە دوایین نامەبوو بۆ لەیلام نووسیبێ، ئەگەرچی پاش چەند ڕۆژێك نامەیەکی سوپاسکردنی بۆ ناردبووم بەڵام من هیچم بۆ نەنووسیەوە، چونکە لە دوا نامەیدا هیچ پرسیارێکی نەکردبوو، منیش تەنها کارتێکی نامە گۆڕینەوەم بۆ نارد.

ئێستا لە جەژنەکاندا لەبری نامە کارتی جەژنە پیرۆزەم بۆ دەنێری لەگەڵ هەندێ هەواڵی خۆشی خۆی، منیش زۆر بەختەوەرم چونکە نەختێ سوودم پێ گەیاند..

 

## لەبارەی حەقەوە (١)



### نامەیەکی کراوە بۆ خوێنەرێکی کچ:

وا لەم نامەیەمدا لەبارەی بابەتی (ڕاستیی )یەوە شتێکت بۆ دەنووسم.

هەروەك دەزانی هەمووان لەبارەی ڕاستیەوە قسەو باسی زۆر دەکەن، بۆیە دەبینی بازاڕی بیرو هزر جەنجاڵ بووە بە چەندها گروپو کۆمەڵی بیروڕا جیاوازو، هەریەکەیان پاگەندەی ئەوە دەکات کە تەنها خۆی ڕاستەو هەر خۆی حەقیقەتە.

لەوانەیە پێت خۆش بێت، منیش هەروا پێم خۆشە کۆتایی بەم جۆرە ناکۆکیانە بێت، بەڵام بە دڵنیایەوە دەزانم کە بەردەوام کۆمەڵ و گروپێك هەبوون نەیاری ڕاستی بوون و دژی وەستاون و تەنانەت لە ڕووناکترین دەورو خول و ڕۆژگاردا کە ڕاستی تێدا پێشکەش کراوە و بڵاو کراوەتەوە. هەر بۆیە منیش وا نابینمو بە تەمای ئەوە نیم ئەو جیاوازیو ناکۆکیە فکریانە – کە تۆ لە نامەکانتدا زۆر بە تاڵی و کەسەرەوە سکاڵات بە دەستیانەوە دەکرد و هاوار و ناڵەت بوو بەدەستیانەوە– نەمێننو هەڵبگیرێن، هیواداریشم هەر ون بن و نەمێنن.

من پێم وایە جێی خۆیەتی لە دوو ڕووەوە باس لە بابەتی (ڕاستی) بکەین: لە ڕووی ماددی و لە ڕووی میتافیزیکیەوە..

چاکیش دەزانم کە مشتومڕی زیاتر لەبارەی دووەمیانەوە هەیە.
بەڵام من وای دەبینم کە ڕاستترینو بێوەیترین ڕێگە بۆ گەیشتن بە ڕووی میتافیزیکی، لەڕێگەی ڕووە ماددیەکەیەوە دەبێت..

پێش ئەوەی پێناسەی (ڕاستی) بکەین بە پێویستی و ئەرکی خۆمی دەزانم کە خاڵێکی گرنگ ڕوون بکەمەوە:

زۆرجار وشەی (ڕاستی)و وشەی (حەقیقەت) وەك دوو وشەی هاو واتا بەکار دەهێنرێن وەك بڵێی هەردووکیان یەك مانا و مەبەستیان هەبێت. چونکە وشەی (ڕاستی) لە ڕووی زمانەوانیەوە بە مانای ( شتی ڕاست و دروست) و (ڕاستگۆیی ) و(واقیع) دێت، دژی ڕاستیش بریتیە لە ناحەقی و بەتاڵ. واتە بیروباوەڕی هەڵەو چەوت و هزری ناڕاست.

هەندێ پێناسەی (ڕاستی)ت بۆ دێنم:

"ڕاستی بریتییە لەوەی کە هەر حوکمێك لەگەڵ واقیعدا تەواو بچەسپێت، دژەکەشی باتڵە"

"ڕاستی بریتییە لە شتی چەسپاو و نەگۆڕ و ڕوون و ئاشکرا کە هەرگیز ئینکاری نەکرێت."

"ڕاستی بریتییە لە بوون، بەڵام باتڵ و ناڕاستیش نەبوونە."

ئەوەی لەناو هەموو ئەم پێناسانەدا هاوبەش بێت ئەوەیە کە بەگۆڕینی کەسەکان هەرگیز ڕاستی ناگۆڕێت، بەڵکو پشتی بە بناغەو قەڵایەکی ئاشکرا و زانراوەوە داوە.

له پێناسەکاندا وشەی " واقیع " و " نەگۆڕ " هاتوون ئەگەر هەر حوکمێك پشتیان پێ ببەستێ بەڕاست دەژمێررێ، وای دەبینم کە بەئەرکی خۆمی دەزانم نەختێ ئەمە ڕوون بکەمەوە:

ئەگەر لێت بپرسم: خۆر چەند ئەوەندەی زەمین گەورەترە؟ وەڵامم دەدەیتەوە: خۆر ملیۆنێك و سێصەد هەزار جار لە زەمین گەورەترە. دیارە ئەم وەڵامەت بە وەڵامێکی ڕاست و دروست دادەنرێت.

بەڵام چ شتێك ئەم وەڵامەی تۆی کردە وەڵامێکی ڕاست؟

ئەوەی ئەم وەڵامەی تۆ پشت ڕاست دەکاتەوە بریتی یە لە واقیعی دەرەوە، واتە قەبارەی خۆر لە گەردووندا ئەوەندە جار لە زەمین گەورەترە.

خۆ ئەگەر وێڕای بوونی ئەم ڕاستی‌یە چەسپاوە، هەر هەموو خەڵك کۆببنەوە و ڕایان بێتە سەر ژمارەیەکی تر، بۆ نموونە بڵێن: خۆر هەزار جار لە زەمین گەورەترە، ئایا ئەمە هیچ لە ڕاستی دەگۆڕێ؟

کەواتە لە گۆڕەپانی زانستدا ڕاستیەکان بە گوێرەی ئارەزووەکان و کەسەکان نین، هیچ تێگەیشتن و فەهمێکی گۆڕاو و جیاوازیش بۆ ڕاستی لە ئارادا نییە. هەر قسەیەك دەکرێ لەگەڵ پەڕاوی گەردووندا بەراورد دەکرێ، ئەگەر لەگەڵیدا چەسپاو و تەواو بوو ئەوا ئەو گفتارە بەڕاست دەژمێرێ.

یەکێ لە زاناکان دەڵێ: " چاوی مرۆڤ تەنها بەرێژەی ٣٪ ی ئەم جیهانە ماددیە دەبینێ کە ئێمەی تێدا دەژین." خۆ دەتوانین بۆ بیستن و بۆنکردنیش هەمان رێژە بدەین بە دەستەوە. عەقڵ هەوڵ دەدات ئەم کەموکوڕیەی کە لە پێنج هەستەکەدا هەیە پڕی بکاتەوە و کامڵی بکات و، ئەو پەڕی هەوڵی خۆی دەدات لایەنە نەبینراوەکانی گەردوون بدۆزێتەوە و پێشکەشیان بکات بەوانەی کە لەو بوارانەی زانستدا پسپۆڕن.

هەر زانایەك بەناوی سەرجەمی مرۆڤایەتیەوە ئەوپەڕی ڕەنجو هەوڵ و تەقەلای خۆی دەخاتە گەڕ بۆ یەکلا کردنەوەو چارەسەرکردنی پرس و کێشەیەك لە پرسەکانی ئەم پەڕاوەی گەردوون، یان بۆ ڕوونکردنەوەی پیتێك لە پیتەکانی ئەو پەڕاوە.

هەندێکیان توێژینەوە لەسەر ڕووەکەکان دەکەن، هەندێکیان خاك...هەندێکیان بەوپەڕی سەرسامی یەوە لە دەماغدا توێژینەوەو وردەکاری دەکەن، یان لە دڵ یان لە دان ورد دەبنەوە.

هەموو گەردیلەیەك، خانەیەك، گەڵایەك لە ڕووەکەکاندا، بەکتریایەك، مێروویەك، ئەستێرەیەك، هەسارەیەك...هەریەکە لەوانە گەنجینەیەکن لە گەنجینەکانی زانست.

مرۆڤێك کە بەدوای ڕاستیدا دەگەڕێ، کاتێ لەبەردەم ئەم تابلۆیەدا دەوەستێ، دەبێ لەخۆی بپرسێ: کێ ئەم گەردوونە بێ گیانو بێ هەستو نەستەی پڕکردووە لە هەموو واتایانە؟ ئەی من

چۆن بتوانم ئەو زاتە بناسم بۆ ئەوەی زانستەکەم و بیروبڕواکانیشم (ڕاست) بن؟

هەرکەسێ بتوانێ وەڵامێکی ڕاستی ئەم پرسیارە بداتەوە، ئەوا دەتوانێ زۆر بە ئاسانی دەرگای هەموو ڕاستیەکانی تریش بکاتەوە...

لەبەر ڕۆشنایی ئەو پێناسانەی بۆ( ڕاستی) کردمانن دەتوانین بڵێین:

پێویستە لەسەر مرۆڤ سیفەتە پیرۆزەکانی زاتی خودا شارەزا ببێت بەو جۆرەی کە لە واقیعدا هەن، ئەگینا هەموو گفتارەکانی ناڕاست و بێهودەو ئەفسانەو وڕێنە دەبن.

بەڵام، ئەم عەقڵە کورت و سنووردارەی مرۆڤ چۆن دەتوانێ پەی بە سیفەتە ناکۆتاو ڕەهاو بێ سنوورەکانی زاتی (الله) ببات؟ تەنیا یەك ڕێگە هەیە، ئەویش ئەوەیە کە خودای تەعالا خۆی سیفەتەکانی خۆی ئاشکرا بکات و هەواڵمان پێ بدات و بۆمانی باس بکات.

ئەوەش بە خوێندنەوەی ئەو پەڕاوانە دێتەدی کە نازڵی کردوون و بە گوێ ڕاگرتن دەبێ لەو پێغەمبەرانەی کە ناردوونی..

ئەمە تاکە ڕێگەو ڕێبازە لەبەردەم مرۆڤدا تاکو ئەو بڕیارو حوکمەی کە دەیدات (ڕاست) بێت، ئیتر هەرچی شتی دەرەوەی ئەمە هەیە، هەمووی ناڕاست و بەتاڵ و هەڵەیە.

بەکورتی، گەردوون مولْکی خودایە، قورئانی پیرۆزیش پەڕاوی ئەوە، مرۆڤیش بەندەی ئەوە، جا ئەگەر ئەم مرۆڤە کە بەندەی خودایە لەبارەی هەرکارێك لەکارەکانەوە دواو قسەی کرد، پێویستە کە گفتارەکەی چەسپاو و گونجاو بێت لەگەڵ پەڕاوی گەردووندا. بەلاّم ئەگەر لەبارەی ڕاستیەکانی خواییەوە قسەی کرد دەبێ گفتارەکەی گونجاو و چەسپاو بێت لەگەڵ فەرمایشتی خوداییدا.

هەر مێشكو دەماخێك بە قورئان زاخاو درابێتو لەسەر ئەو پەروەردە کرابێت ئەوا بەم جۆرە بیر دەکاتەوە:

مادام ئەم بوونەوەرە پەڕاوێکەو هەر پیتێك لە پیتەکانی چەندین مانای بێ سنووری هەیە، کەواتە ئەرکی سەر شانی ئێمەیە چاك بزانین کە ئەو زاتە پیرۆزەی نووسیویەتی، نە لە "زات"ی نە لە "سیفات"ەکانیدا لە هیچکام لە بەدیهاتووەکانی خۆی ناچێت.

مادام ئەو بەدیهێنەرە مەزنە هەموو شتێکی لە جێگەی ڕاستو شیاوی خۆیدا داناوە، کەواتە خۆی دەکەوێتە دەرەوەی بازنەی جێگەو مەکانەوە، چونکە شتێکی ئاسایی و بەڵگەنەویستە کە ئەو زاتەی (جێگە)ی دروست کردبێ نابێ خۆیشی پێوەی بەندو پەیوەست بێت.

مادام چەندەها بەدیهاتوو هەن و هەموو کاتێك بێ وەستان دێنە بوونەوەرەوە، کەواتە بەدیهێنەرەکەیان دەبێ لە کات و زەمان بەری بێت.

ئەو مرۆڤەی کە بەم شێوەو لەسەر ئەم جۆرە بڕوای بە خودا هەبێ ئەوا خۆی و هەموو شتەکان دەگێڕێتەوە بۆ لای خوای تەعالا، واتە تەواو دڵنیا دەبێ بەوەو دەڵێ:

( ئێمە هەموومان موڵکی ئەوین، هەموو بەدیهاتوانیش بەدیهێنراوی ئەون، هەموو جیهان و بوونەوەران موڵکی ئەون، هەموو ڕوخسارەکانیش لە نەخش‌و وێنە کێشانی ئەون، هەموو جوانیەکانیش درەوشانەوەی دەست ڕەنگینی و نەزاکەت و جوانیی ئەون).

ئەگەر مرۆڤێک هەموو شتێك بگێڕێتەوە بۆلای خوا یان نەگێڕێتەوە، تۆسقاڵێك لە حەقیقەت ناگۆڕێ، بەڵام ئەگەر ئە وکارە بکات ئەوا بۆ خۆی شتێکی مەزن ئەنجام دەدات.

زۆرجار مرۆڤ لەوەدا سەرکەوتوو نابێ کە هەموو شتێك بگێڕێتەوە بۆلای خودای تەعالا، بەهرە لە شتەکانیش وەرناگرێ و لە جێگەی ڕاست و شیاوی خۆیاندا دایان نانێ و بە نەزانی ڕەفتاریان لەگەڵ دەکات، بۆیە ئەو سەرمایە گرانبەهاو بەنرخە لە کیس دەدات و لە شتی فانی و بێ کەڵك و پڕوپووچدا بە هەدەریان دەدات. ئەو جۆرە کەسانە هەمیشە ئەمپەڕو ئەوپەڕی قسەیان ئەوەیە باسی ماڵی فڵانەکەس، سەیارەکەی فڵانەکەس، زەویەکەی فڵانەکەس بکەن، واتە چی سامان‌و پلەو پایەی دنیا هەیە هەمووی دەدەنە پاڵ

دنیاویستان‌و ژیانی نەختینەی خۆیان بەم کاروبارانەوە بەسەر دەبەن..

ئەوەتا هەموو دەوروبەرمان بەم جۆرە کەسانە دەورە دراوە، من هیوادارم تۆ سەرکەوتوو بی و بتوانی ئەم گەمارۆیە بشکێنیت و خۆت بگەیەنیتە ڕاستی و حەقیقەت.

والسـلام..

## لەبارەی حەقەوە (٢)

لێرەدا بەکورتی باسی چۆنیەتی هەڵسەنگاندنی بوونەوەر و مرۆڤ دەکەم.

بوونەوەر تەلارێکی گەورەیە، مرۆڤیش تیایدا میوانە، نە تەلارەکە بێ خاوەنەو نە مرۆڤیش دەستی لێ بەردراوە بەئارەزووی خۆی چی دەکات بیکات.

مرۆڤ و بوونەوەر...هەردووکیان قۆناغ بە قۆناغ و هەنگاو بە هەنگاو و پلە بە پلە لە نەبوون درووست کراون... گەردوون بە بەردەوامی لە گۆڕاندایە، مرۆڤیش بەبێ وەستان لە هاتن‌و ڕۆشتندایە و چینێك دێنە ناوەوەو چینێك لێی دەردەچن. ئەم جموجۆڵ و چالاکیە بەردەوامەی کە نە سەرەتای بۆ هەیەو نەکۆتایی، وانەیەکی ڕوون و ڕەوانە بۆ ئەوانەی دڵ و هۆش و بیریان لەدەست نەداوە.

مادام هەموو شتێك بەردەوام لە گۆڕان‌و جوڵەو بزواتندایە، کەواتە زاتی پیرۆزی خودا (کە ئەوان دەجوڵێنی‌و دەگۆڕێ ) بۆ خۆی ناگۆڕێ و بۆی دروست نییە کە بجوڵێ.

ئەم کۆتا ڕستەیە پێناسەیەکە بۆ ناوێك لە ناوە جوانەکانی خودا کە ناوی (الحقّ)ە. هەروەها پێناسەیەکی تریشی هەیە دەڵێ: ( حەقی ڕەوا ئەوەیە کە مەوجودە بەزاتی خۆی، واتە هەر خۆی مەوجودی ڕاستەقینەیە، هەموو مەوجودێکی تر لەوەوە حەقیقەتی خۆی وەردەگرێ).

بوونی ئێمەش لەمڕۆدا هەر دەگەڕێتەوە بۆ چاکەو فەزڵ‌و پرتەوی بوونی خوداو درەوشانەوەیەکی ناوی (المُوجِد)ی خۆی. ئەگەر شێوەو ڕوخسارێکیشی هەبێت هەر بەچاکە و فەزڵی خودا و درەوشانەوەی ناوی (المُصَوِّر) ی ئەوە.

ئێستا گەیشتوینەتە خاڵێکی گرنگ:

سیفەتی (الوجود)ی حەق تەبارەك وە تەعالا وەك هەموو سیفەتەکانی تری بەدەرە لە گۆڕان و ئاڵ‌وگۆڕ، بەڵکو ڕەهایە و بێ سنوورە.

سیفەتی (ئەحەدیەت)یش کە یەکێکی ترە لە سیفەتە زاتیەکانی خوای گەورە، دیسان ناگۆڕێت و هەرگیز نابێ بیر لە گۆڕین و ئاڵ‌وگۆڕی بکەینەوە. خودا هەمیشە تاك و تەنیایە، جیایە لە ڕووداوەکان، واتە چیەتی پیرۆزی ئەو هەرگیز لە چیەتی هیچ

بەدیهاتوویەك لە بەدیهاتووەكانی ناچێت، ئەم سیفەتەیشی باقی و ئەزەلی و نەگۆڕە.

هەر بەو جۆرەش توانای ئەو ناكۆتایە و زانستی بێ سنوورە و هیچ گۆڕانێكی بە سەردا نایەت. هەموو سیفەتەكانی تریشی بەو جۆرەن.

بەڵام با لەبەردەم سیفەتی (زانست) دا هەڵوێستەیەك بكەین:

زانستی خودا ڕەها و ناكۆتایە، بەدەرە لە هەڵە یان گۆڕان یان لەبیرچوونەوە، بەڵام زانستی مرۆڤ وەك خودی مرۆڤەكە لە گۆڕانێكی بەردەوامدایە، ئەو شتەی كە پێشتر بڕوای وابوو ڕاست و دروستە، لەوانەیە دوایی بۆی ڕوون ببێتەوە كە هەڵەیە.

بەڵام هەرگیز عەقڵ نایبڕێ كە هیچ ئاڵوگۆڕ یان گۆڕانێك لە زانستی خوادا ڕوودات، چ زەمین و چ خۆریش هەردووكیان بەدیهێنراوی خودان و هەر خۆی باشتر بە جوڵانەوەی ئەوان زاناترە.

كاتێك مرۆڤ بە خولانەوەی زەمینی زانی بەدەوری خۆردا، ئادەی چی پێ كرا؟ هەر ئەوەندە بۆیان دەركەوت كە ئەو بەدیهاتوانە بە شێوەیەكی گونجاو و لەگەڵ زانستی خودادا دەجوڵێنەوە، كاتێكیش گەیشتن بەم دۆزینەوەیە هوتافیان كێشا:

" وا ڕاستیمان دۆزیەوە "

خۆ ئەوان لەمەدا ڕاستیان دەوت، چونكە ئەم بڕیارەی كە دایان تەواو گونجاو بوو لەگەڵ ڕاستیدا، واتە لەگەڵ واقیعدا چەسپاو بوو.

هەر بۆیە ئێمە وەڵامی پرسیار گەلێکی لەم جۆرەی خوارەوە دەدەینەوە:

- بۆچی بوونەوەر درووست کراوە؟
- ئەرك و فەرمانی سەرەکی مرۆڤ لەم دنیایەدا چییە؟

بۆ ئەوەی وەڵامەکانی ئەم پرسیارانە ڕاست و ڕەوان بن پێویستە تەباو هاوتەریب بن لەگەڵ زانستی خوداییدا. ئەگینا خۆمان‌و خەڵکیش چەواشە دەکەین...حەق‌و ڕاستیش هەروەك خۆیانن، نەدەگۆڕێن‌و نە گۆڕانکاری بەسەریاندا دێت.

بۆ نموونە وەڵامی پرسیاری: ( لەم دنیایەدا ئەرك و فەرمانی مرۆڤ چییە؟) پێویستە بەم جۆرە بێت:

پێویستە ئەرکی مرۆڤ بریتی بێ لەگەڕان‌و پشکنین‌و لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی هۆکارەکانی ئەوەی بۆچی خودا مرۆڤی بەدی هێناوە، ئەو ئەرك‌و فەرمانانە کامانەن کە لێی چاوەڕێ دەکرێت تا ئەنجامیان بدات، ئەوکارانەی کە پێویستە پێیان هەڵسێت، ئەو کارانەی کە دەبێ لێیان دووربکەوێتەوەو دوورە پەرێز بێت، چۆن هەڵس‌و کەوت بکات، دەبێ لەم ژیانەدا ڕەفتار و ئاکاری چۆن بێت؟

ئائەمەیە ئەرکی ئەو، نەك فەرامۆش کردنی فەرمانەکانی خودا و بە تەنیا گوێگرتن بۆ ڕاو بۆچوونەکانی مرۆڤێکی وەك خۆی کە ئەویش لە دایك بووە و گەورە بووەو خەوتووە و لە خەو هەڵساوەو سبەینێ دەمرێ‌و پاشان لە ڕۆژی قیامەتدا زیندوو دەبێتەوە بۆ یەکلا

کردنـەوەی حیسـاب، بـە شـوێنکەوتنی ئـەو جـۆرە کەسـانە هـەرگیز ناتوانیٚ بگاتە وەلآمی ڕاست و دروست.

لە کۆتایی نامەکەدا پێم خۆشە پەنـدێك کـە پـێش چـەند سـاڵێك خوێندومەتەوە و لەبیرم نەچووەتەوە لێرەشدا تۆماری بکەم:

خـودا تـاك وتەنهایـە، ڕێبازەکەیشـی یـەك ڕێبـازە، نـابینی هێڵـی ڕاستی نێوان دوو خاڵ دەبـێ یـەك ڕاسـتەهێڵ بـێ؟ بـەڵام نـەفامی و لادان زۆر و زەبەنـدەن؟ بۆیـە دەتـوانین لـەنێوان ئـەو دووخاڵـەدا چەندەها هێڵی لار و گێڕ بکێشین.

ئومێدەوارم سەرفراز و سەرکەوتوویی بۆ پەی بردن و دۆزینـەوەی ڕێبازی ڕاست.

والسـلام



## خێزان

هەموو بوونەوەر شارێکی پڕ بە یاساو دانایی یە، هـیچ ڕەگـەزێکی زیادو بیٚ مەبەستی تێدا بەدی ناکەیت، یان پێکهاتەیەکی بیٚ دانایی‌و بیٚ ئەرك‌و بێکاری تێدا نابینیت.

هەر لە ئەندامەکانەوە بیگـرە کـە یـەك جەسـتەیان پێـك هێنـاوەو لەنێوان خۆیاندا هاوکاری یەکتر دەکەن تا کۆمەڵەی خـۆرو تادەگاتـە گەلەئەسـتێرەکان، تێکـڕای بوونـەوەر ئـەم ڕاسـتیەیان بـۆ ڕوون دەکەنـەوە کـە دەڵێـت: لـەم جیهانـەدا هـیچ ڕێکـەوتنێك نییـە بـەبیٚ سوودو بیٚ دانایی بیٚ.

خێزان بە بەنرخترینو بایەخدارترینی ئەو زنجیرەی هاوکاریانە دادەنرێت کە لەم جیهانەدا هەیە، بۆیە خێزان مەبەستێکی گرنگ و ئامانجێکی بەرزی لە خۆ گرتووە. ئایا ئەو مەبەستە چییە؟ ناتوانین وەلامی ئەوپرسیارە بەم جۆرە بدەینەوە و بڵێین: "مەبەست بریتی یە لە تێرکردنی هەواو هەوەسی هەردوولا. " چونکە ئەم جۆرە وەلامە ئەم پرسیارەش دێنێتە ئاراوە: ئەی نابینی کە ژیانی خێزانداری ئەم مەبەستە لە قالبێکی تەسکدا دادەنیٚ؟ ئەی ئەوە نییە جیهانی گیانداران لەبەدەست هێنانی ئەو مەبەستو ئامانجەدا زۆر لەجیهانی مرۆڤایەتی پێشکەوتوو ترە؟

کەواتە با بەدوای وەلامێکی تری پرسیارەکەماندا بگەڕێین و بڵێین:

هەریەك لە ژن و پیاو توانای جیاواز و تایبەتمەندی جیاوازیان هەیە. ئەم تواناو تایبەتمەندیانەش لەژێر یەك چەتری خێزاندا پێك دەگەن و لەهەموو بوارەکاندا هەریەکە و ئەوی تر تەواو دەکەن.

ئەگەر چی ئەم وەلامە لەناخیدا بەشێك لە حەقیقەتی هەلگرتووە، بەلام ئەگەر ئەم بابەتە لەسەر بنەمای دەستەبەرکردنی ژیانێکی ئاسوودە و خۆش گوزەران لەم ژیانی دنیایەدا بنرخێنرێت، دیارە هەرگیز ئەم وەلامە پێداویستیەکانی ڕۆح تێرو تەسەل ناکات. ئەی چۆن ئەو وەلامە قەناعەت بەڕۆح و گیانمان بکات و تێر و مەستی بکات؟ خۆ ئەوەتا جیهانی گیاندار هەموو ئەوانەی بەدەست هێناوە

و هیچ غەم و ترسێکی ڕابردوو یان داهاتووی پێ نییە و هەموو پێداویستیەکانی بۆ بەردەست خراوە و ڕزگاری بووە لە مشوری پۆشاك و کەلوپەلی ماڵو سوتەمەنی و، بە تەسەلی چێژ لە ئەمڕۆیو لە تێکڕای ژیانی وەردەگرێ. ئایا ئەوە جێی قبوڵکردنە کە خاوەنو بەدیهێنەری ئەم بوونەوەرەی کە لەیەك گەردیلەدا ئەوەندە هێزی داناوە کە بتوانێ شارێك بەتەواوی بهێنێتە لەرزین، تۆ بڵێی ئەو زاتە مەزنە هەردوو ڕەگەزی ژن و پیاو تەنیا بۆ مەبەستێکی دنیایی ڕووت بکاتە هاوسەر!.

ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە دەمانگەیەنێتە بەر دەرگای حەقیقەت. کاتێك ئەو دەرگایە دەکەینەوەو هەنگاو دەخەینە ئەودیو، دەبینین کە ئەم دنیایە لانەی دانایيو جیهانی هۆکارەکانە...خۆ ئاسمان سێو نابارێنێ، مرۆڤیش لەزەویەوە ناڕوێت. کەواتە میوەو بەروبووم پێویستیان بە دارو درەختە، بۆ ئەوەی منداڵیش بێتە دنیاوە دەبێت هاوسەرگیری بکرێت، ئەوە یاسایەکی خوداییە. کاتێکیش هەردوولا ڕەچاوی ئەم یاسایە دەکەن، ئەگەر لەچارەیان نووسرابێ منداڵیان پێ خەلات دەکرێ. ئەم منداڵە بچوکەیش کە بۆ تاقیکردنەوە نێردراوە بۆ دنیا کۆرپەیەکی بچوك و لاوازەو هیچ شتێ لەبارەی دنیاوە نازانێ، بەلام خودا دایك و باوکی بۆ دەکاتە خزمەتکار. ئەو منداڵە بچوکەیش بۆ دایك وباوکی لەلایەکەوە دەبێتە خەلاتو دڵخۆشيو سۆز بۆیانو، لەلایەکی تریشەوە دەبێتە مایەی

مانـدووبوون و ئـێش و ئـازار. لێـرەدا جیـاوازی نێـوان منـدالآن و بێچـووەكانی گیانـدارانمان بۆدەردەكـەوێ. هـەر لێرەشـەوە دەردەكەوێت كە جیاوازیەكی ئێجگار گەورەو گرنگ هەیە لـە نێـوان هاوسەرگیری مرۆڤ و جووت بوونی نێرو مێی ئاژەلآندا. بەڵێ، مندالآن خەلآت و دیاریو بەرەكەتن بۆ دایكو باوك، چونكە بەهۆی چاودێریو بەخێوكردنی ئەو بەدیهاتووە بچووكو ناسكو دڵخۆشو بەختیارانـەوە ئەمانیش پاداشتیان دەست دەكەوێت، هەرچی بەخێوكردنیان هەیە: خـواردن، پۆشـاك، جێگـە، خانەولانـە، سەرپەرشـتی گـەورەبوون، پەروەردەكردنو خستنەبەر خوێندن تا پێگەیانـدن هـەمووی دەبێتـە خێرو صەدەقە بۆ دایك و باوكیان. بەم جۆرە تەنانەت ئەو كەسەیش كـە پیسـكەو چاوچـنۆكەو لەژیانیـدا یـەك فلسـی نـەداوە بەدەسـتی هەژارو داماوێكەوە، بەهۆی بـەخێوكردنی ژنو منداڵەكانیـەوە خێـری دەست دەكەوێ. هەروەها مندالآن بەخششو خەلآتن، چونكە ئەگـەر دایك وباوك بە شێوەیەكی ڕاستو دروست منداڵەكانیان فێربكەن كـە لـەكوێوە هـاتوونو چارەنووسـیان بـەرەوكوێ دەڕواتو ئـەركو فەرمانیان لەم ژیانەی دنیادا چییە، ئەوە پشكێكی بچوكی شـەرەفی بەشداری كردنیان هەیە لەئەركو پیشەی بەرزو پیرۆزی پێغەمبەرانـدا ( سەلامی خوایان لێ بێ) كـە ئـەویش ئـەركی بـەجێهێنانی تـەبلیغ و گەیاندنی فەرمانەكانی خواوەندو ڕێنومایی و ئیرشاد كردنی خەڵكـە، ئەگەر چـی لـەناو بازنەیـەكی بچووكو سـنوورێكی تەسكیشـدا بێـت.

پاش ئەوە منداڵەکانیان بە درێژایی ژیانی ئەم دنیایەیان هەر چاکەیەك بکەن پشکێکی دەڕوات بۆ دایك و باوکیان:

﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَاراً وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ ﴾ التحريم:٦.

فەرموودەی پیرۆزیش دەفەرموێ: (كُلُّكُم راعٍ وَكُلُّكم مسؤلٌ عن رَعيَتِه) لەلایەکی تریشەوە منداڵان دەبنە هۆکاری سزادان، چونکە منداڵان ئەمانەتو سپاردەن لە ئەستۆی دایك و باوکیانداو فریشتەی بەهەشتن، جا ئەگەر ئەو منداڵانەیان فێری خواناسی نەکەنو وەك پێویست پەروەردەیەکی ڕاست و دروستیان نەکەنو ئەرکی باوك و دایکێتی خۆیان بەرامبەر منداڵەکانیان بەجێ نەهێنن، ئەوا ئەو منداڵانە لەژیانیاندا چەندە خراپەو گوناح بکەن، باوكو دایکیشیان پشکی ئەو زیانەیان بەردەکەوێ. هەروەها هەندێ دایك و باوك کە لەپێناوی دەستەبەرکردنی خۆشگوزەرانی بۆ منداڵەکانیاندا پەنا دەبەنە بەر کارو کاسپی حەرامو بەدەستهێنانی سامانی حەرام، بەوەش ژیانی قیامەتی خۆیان دەخەنە بەر مەترسی. ﴿إِنَّما أَموالُكُمْ و أَولادُكُم فِتنَةٌ، واللهُ عِنْدَهُ أَجرٌ عَظيم ﴾ التغابن: ١٥. پێغەمبەرمان ﷺ مافی دایكو باوك بەسەر منداڵەکانیانەوەو مافی منداڵانی لەسەر دایكو باوك دیاری کردووە، باسی فەرمووە کە دەبێ باوکان لە هەڵبژاردنی دایکدا بۆ منداڵەکانیان وردەکار و ژیرانە ڕەفتار بکەنو ئافرەتی چاك هەڵبژێرن، هەروەها ناوی جوان لە منداڵەکانیان بنێنو

لەسەر پەروەردەیەکی بەرزو پیرۆز گۆشیان بکەنو پێیان بگەیەنن.
لەبەرئەوە هەرکات باسی (خێزان)و دواتر (هاوسەرگیری) بکرێت، باسی منداڵو پەروەردەکردنی منداڵانیش دێتە ئاراوە. هەر کچێکیش بە نووری ئیسلام دڵی رووناك بووبێتەوەو بە ئیمانیش ڕۆحی بەرز بووبێتەوە، چاك دەزانێ کە گرنگترین خاڵ لە هاوسەرگیری ئەودا بریتی یە لەپەروەدەکردنی منداڵ. تەنانەت پێش ئەوەی هاوسەرگیری بکات بیر لەوە دەکاتەوە کە چۆن لە داهاتوودا بەختەوەری هەمیشەیی بۆ منداڵەکانی دەستەبەر بکات، هەر بەم هەستەوە ڕوودەکاتە پرۆسەی هاوسەرگیری، هەمیشە بیری لەلای درەوشانەوەی سۆزو بەزەیی خواوەندە کە هەموو خۆراکەکانی ئەم بوونەوەرە لە جەستەی دایکدا بە چەند کردارێکی تایبەت دەگۆڕێ بۆ شیرێکی پاكو سپیو نەرم و دەڕژێتە ناو دەمی منداڵەوە. کەواتە ئەم منداڵەی کە خودا بەو هەموو ناسکیە دەیژیەنێتو بەخێوی دەکات، هەرگیز بارو قورسایی لەسەر بژێوی خێزان دروست ناکات، ئەو ژنە کەلوپەلی ماڵ و مۆبیلیات و کەرەسەی جوانکاریو ئارایشو مۆدێلات بە گرنگترو بایەخدارتر نازانێ لە پەروەردەکردنی منداڵەکانی، ئیدی بەخێوکردنو پەروەردەکردنیان ناسپێرێ بەخزمەتکار یان دایەنگاکان، چونکە زۆر چاك دەزانێ کە: هەروەك لاشە بچوكو ناسکۆڵەکەی ئەو کۆرپەیە پێویستی بەشیری دایکی هەیە، هەر بەو جۆرەش ڕۆحە ناسك و پەپولەییەکەیشی پێویستی

بەسۆزو میهری ئامێزی دایکی هەیە، ئیدی ئەو دایکە نابێتە هۆی بێ نازبوونی منداڵە چاوگەش‌و گوڵەناسکەکانی‌و، لەبەر ئیش‌وکار بەجێیان ناهێڵێ تا هەست بە بێزاری‌و داخ‌و پەژارەی جیایی دایکیان بکەن و، ڕێگە نادات تالاّوی چاوەڕێی هاتنەوەی دایکیان بچێژن... کاتە باشەکانی ڕۆژ تەرخان ناکات بۆ فلاّنە شت وفیسارە شت، بەڵکو تەرخانی دەکات بۆ ئەوان. چونکە ئەوە ستەم کردنە لەو مندالاّنە کە ئەو وەختانە تایبەت بکات بە منداڵەکانیەوە کە بە شەکەت‌و ماندوویی لەئیش دەگەڕێتەوە و خەریکە وەختی خەوتن و پشووی خۆی بێت و هیچ حەوسەڵەو تەحەمولێکیان لەگەڵ نەکات و جامی گرفت‌و ماندووبونەکانی خۆی بەسەر ئەواندا بڕێژێ.

جا ئەگەر پیاویش تێگەیشتوو بێت و هەست بەو لێپرسراوێتیە بکات ئەوا دەزانێ کە ژن چ ڕۆڵێکی گەورە و گران دەبینێ لە پەروەردەکردنی منداڵاندا، لەو کاتەشدا بڕیاری هاوسەرگیری دەدات ئەم پرسە ڕەچاو دەکات‌و دەیخاتە پێشەوەی خاڵە گرنگەکان.

**لەئیسلامدا منداڵ سێ مافی هەیە:**

١- دەبێ دایکێکی چاك و پاکداوێنی بۆ هەڵبژێردرێت.

٢- ناوێکی جوانی لێ بنرێ.

٣- لەسەر پەروەردەیەکی موسوڵمانانە پەروەردە بکرێت.

کەواتە ئیسلام لەخاڵێکەوە دەست بە پەروەردەکردنی منالاّن دەکات کە ئەندێشەی دەروونناسان و زانایانی پەروەردەو

کۆمەڵناسی دەستیان نایگاتێ و پەی پێ نابەن. ئەوەتا هێشتا منداڵێتی لەجیهانی غەیبدایەو بەرلەوەی بێتە دنیاوە دەست پێ دەکات. ئیسلام هەر لەوێوە ئەو ئەرکە دەخاتە ئەستۆی پیاو و ڕایدەسپێرێ کە دایکی پاك‌و چاك بۆ منداڵەکانی هەڵبژێرێ، هەرپیاوێکیش ئەم ئەرکەی ڕەچاو کردو بەلایەوە گرنگ بوو کە ژنێکی چاك‌و پاك بخوازێت ئەوا بەشێکی گرنگی ئەرکی سێیەم بەدەست دەهێنێ.

نیکاح گرێبەستێکی کارپێکراوە لەپێکهێنانی خێزاندا، بەڵێننامەیەکە بۆ ئەنجام دانی ئەو ئەرکانە. بەگوێرەی ئەو گرێبەستە پیاو بەڵێن دەدات کە لە داهاتوودا گوزەران‌و پێداویستیەکانی ژن‌و منداڵەکانی دەستەبەرو دابین بکات. ژنیش بەڵێن دەدات کە خۆی بۆ مێردەکەی و ئەو خێزانە تەرخان بکات کەمێردەکەی سەرۆکیەتی.

هەروەها نیکاح تا ڕادەیەکی زۆر و بە شێوەیەکی گشتی هەردوولا لەوە دەپارێزێ کە گوناح بکەن یاخود گرفتار ببن بە گوناح کردنەوە: ﴿هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ﴾ البقرة: ١٨٧، دەبێ ژن و پیاو بەهۆش و بیرو تێگەیشتنێکی ڕوون‌و ئاشکراوە هاوکاریی یەکتری بکەن. ئەم ئایەتە پیرۆزە دەفەرموێ: ﴿ و تَعاوَنوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلا تَعَاوَنُوا عَلَى الإِثْمِ وَالْعُدْوانِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ

الْعِقَـــابِ ﴾ المائـدة: ٢، بێگومـــان ئـــەم هاوکارییـــە ژن و مێـــردیش دەگرێتەوە.

قورئـانی پـیرۆز باسـی ئـەوە دەکـات کـە ئامـانج لـەناردنی مـرۆڤ بۆسەر زەمین (نێر بێ یا مێ) بریتـی یـە لـە پەرستشـی خـودا، واتـە بڕینـی قۆناغـەکانی ڕێبـازی خواناسـی و بەسـەر بردنـی تەمـەن لـە سنووری فەرمانەکانی خوادا، پاشان لـە ئاکـام وکۆتـایی کاروانیشـدا بگەڕێتەوە بۆ حزوری خواوەند و شایستەی چـوونە بەهەشـت ببێـت. ئەمە ئەو ئامانجەیە کە پێویستە هەردوولا هاوکاری یەکتربکەن بۆ بە دەست هێنانی‌و ڕەنجەڕۆ نەبن و پێکـەوە ژیـانی هاوسـەرگیریی ئـەم دونیایەیان بە مردن کۆتایی پێ نەیەت و لێك جیاببنـەوە، بـەڵکو بـە هەمیشەیی دوای مردنیش هەر بەردەوام پێکەوەبن.

بـەدیعوززەمان سـەعیدی نورسـی لەپـەیامی (ڕابـەری خوشـکان) لاپەڕە ٥٢ کە بەشێکە لـە بـەرگی (بریسـکەکان) دەفـەرموێ: ( ئـای ئەو مێردە چەندە بەختەوەرە کە دینداریی ژنەکەی ڕەچاو دەکـات و چاوی لێ دەکات و وەك ئەو دەبێتە کەسـێکی دینـدارو ئـیتر لـەژیانی هەمیشـەیی و نەبڕاوەشـدا هاوەڵـە بەوەفاکـەی خـۆی لـە دەسـت دەرناچێت.

چـەندە ئـەو ژنـەش بەختـەوەرە کـە دینـداری هاوسـەرەکەی دەبینـیو دەترسـێ لـە ژیـانی نەمریـدا هاوەڵـە ئەمینەکـەی خـۆی لەدەست دەربچێ، لەبەر ئەوە دەست بە ئیمانو تـەقواوە دەگـرێ.)

لێرەدا ڕووبەڕووی گرنگترین پەندو سوودە باڵاکانی ژیانی خێزان دەبێتەوە. بەگوێرەی ڕێنماییەکانی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ فێرمان دەکات کە: ژیانی ئەم دونیا مەزرەعەت و کشتوکاڵی ژیانی دنیاکەی ترە، کەواتە ئەو ئاسوودەیی‌و بەختەوەریەی لەم دنیادا لە ناو خێزاندا هەیە وەك (تۆو) وایە، ئەگەر ئەو تۆوە ئاو بدرێت‌و چاودێری بکرێت‌و بەخێوبکرێت، ئەوا دەڕوێ‌و گەورە دەبێ و لە قیامەتدا دەبێتە دارێکی گەورەو بەروبوومی خۆی دەدات.

بەهەشت ئەگەر بەراوردی بکەین لەگەڵ ئەم دنیایەدا چەندە جوان‌و پیرۆزە، ژن‌و مێردی ئیمانداریش ئەو چێژو خۆشیەی کە لە بەهەشتدا دەستیان دەکەوێت هەر بەهەمان پلەی بەرزی و جوانی و خۆشی دەبێت.

باڵێرەدا ئەم مژدەیەی خودا تۆمار بکەین کە دەفەرموێ: ﴿ وَبَشِّرْ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ كُلَّمَا رُزِقُوا مِنْهَا مِنْ ثَمَرَةٍ رِزْقاً قَالُوا هَذَا الَّذِي رُزِقْنَا مِنْ قَبْلُ وَأُتُوا بِهِ مُتَشَابِهاً وَلَهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ وَهُمْ فِيهَا خَالِدُونَ﴾ البقرة: ٢٥.

ڕاڤەکەرو لێکۆڵەرانی قورئان دەڵێن (أزواجٌ مُطَهَرةَ ) بریتین لە ژنانی پاك بۆ پیاوان و پیاوانی پاك بۆ ژنان. پاکێتی لە ژناندا بەو مانایەش دێت کە دوور بێت لە هەموو پیسیەکی ماددی یان سووڕی مانگانەی ژن. بەڵام پاکێتی مەعنەوی واتە نەبوونی هیچ لایەنێکی

بەدڕەوشـــتی یـــان نالـــەباری و لاســـاری‌و هەڵنـــەکردن لەگـــەڵ هاوسەرەکەیدا.

ئا ئەمەیە زانست و حیکمـەت‌و پەنـدی ژیـانی خێزانـی، واتـە ئـەو بەختەوەری یە هەمیشەییەی کە ئەم ژیانە بـۆ مرۆڤـی دابـین دەکـات لەدونیادا.

## کام ڕەوشت؟

لەگەڵ ناوهێنانی (مرۆڤ) دا دوو چەمك‌و تێز بەبیرو زەینماندا دێن. (جەسـتە ) و ( ڕۆح)، وشـەی سـیماو دیمـەن بـەکار دەهێـنین بـۆ جەستە، وشەی ڕەوشـت‌و ڕەفتـاریش بـۆ ڕۆح. خـۆ ئەگـەر لەلایـەنی بەدیهاتنیشـەوە باسـی بکـەین بـە جەسـتە دەڵـێین: ( بـەدیهاتوو- خەلق ) بە ڕۆحیش دەڵێن (ئاکـار- خولـوق). کـە دەڵـێن ( ڕەوشـت جوان) یان (ڕەفتـار چـاك) ئـەوە ئامـاژە بـۆ جـوانی نـاوەوەی مـرۆڤ دەکـەین. مـرۆڤیش لەلایـەنی بەدیهاتنـەوە بـە ڕووخسـارو ڕەویـەو ڕەفتاریش جوانە. لەجەستەیدا ئەنـدامێکی نوقسـان یـان ئەنـدامێکی زیادە نابینی، لـە ڕۆحیشـیدا هـیچ هەسـتێك یـان لەتیفەیـەکی زیـادە نییە کە هیچ کارێکی نەبێ. جـا هـەروەك گونجـانێکی تـەواو لـەنێوان ئەندامەکانی جەستەیدا هەیە، هەر بـەو جـۆرە هەماهـەنگی‌و تـەبایی لـەنێوان هەسـتەکانی دا هەیـە. کەواتـە چ مانایـەك لـە باسـکردنی ڕەوشتی باش یان ڕەوشتی خراپدا هەیە؟ بە وروژاندنی ئەم پرسیارە گـرنگترین تایبەتمەنـدێتی ڕۆحـی مرۆڤمـان بـۆ دەردەکـەوێ. بـەو

تایبەتمەندیەش دەڵێن ویستی هەندەکی "الإرادة الجزئیة"، مرۆڤیش ئیرادەو ویستی خۆی یا لە ڕێگەی چاکەدا یان لەڕێگەی خراپەدا بەکاردەهێنێ. جا یان ئەوەتا جوانی ونازداری ناوەوەی خۆی زیاتر دەکات، یان ئەوەتا ئەو جوانیە وێران دەکاتو تەواو ڕەزاگرانی دەکات. هەموو مرۆڤەکان لەوەدا هاوبەشن کە بایەخ بەجوانی و ڕواڵەتی خۆیان دەدەن، لەمەشدا خەڵك جیاوازیەکی ئەوتۆ لەنێوانیاندا نییە، ئەگەر هەرکەسێ لە ئاوێنەدا تەماشای خۆی کردو لەسەر ڕوومەتی ڕەشاییەك یان پەڵەیەکی بینی ئەوا هەمووان دەزانن کە ئەو ڕەشاییە یان پەڵەیە جوانیو سیمای مرۆڤ دەشێوێنێ. بەلام بۆچی نابیبنین بەو جۆرە بایەخ بەجوانی ڕۆح بدرێت؟ بۆچی لەم بوار و بابەتەدا کۆدەنگی و یەکدەنگی بەدی ناکەین؟

وەلام: چونکە ئاوێنەکان جیاوازن...نامەوێ بڕۆمە ناو بابەتی جیاوازبوونی ڕوانین و بۆچوونەکان سەبارەت بەڕەوشت. بەڵکو تەنها بەکورتی باس لەو بەهایانە دەکەم کە ڕۆح و گیانی مرۆڤ جوان دەکەنو دەیڕازێننەوە، لەگەڵ ئەو پێوەرانەدا کە لەلایەنی ڕەوشت و ئاکارەوە مرۆڤ بەرزو بڵند دەکەنەوە.

سەبارەت بەڕەوشتو ئاکاری پێغەمبەرمان ﷺ پرسیار لە حەزرەتی عایشە "خوا لێی ڕازی بێ" کرا، ئەویش فەرمووی: ( ئایا ئێوە قورئان دەخوێنن؟ وتیان: بەڵێ. فەرمووی: دەی ڕەوشتی ئەو قورئان بوو.)

ئەم وەڵامە کورتو ناوازەیە ئەوە بۆ موسوڵمانان دیاری دەکات کە چ ئاوێنەیەك هەڵبژێرن بۆ ئەوەی چاودێریو ئارایشتی ڕۆحی خۆیانی پێ بکەنو دابو نەریتەکانیانی پێ پێوانە بکەنو سیفەتو بەهرەو تواناکانی خۆیانی پێ ڕێك بخەن. ئەو ئاوێنەیەش قورئانی پیرۆزە. ئەو ڕەوشتانەیش کەخودا داوای کردوە لە ئیمانداران خۆیانی پێ برازێننەوە بریتین لە ڕەوشتەکانی قورئان.

کاتێك لەبارەی مرۆڤێکەوە بوترێ ( کەسێکی ڕەوشت بەرزە ) یان (مرۆڤێکی ڕەوشت جوان )ە، ئەوا یەکەم شتێك بەبیردا دێت ئەوەیە کە ئەو کەسە: ڕاستو پاكو پاکداوێن و لێبوردەو نەرمونیان و خاکیی و ڕووخۆشەو ڕەچاوی مافی خەڵك دەکات.

هەموو ئەم واتایانە ڕاستو دروستن بەڵام کەموکورتو ناکامن... تەنها قورئانی پیرۆزە کە ئەو ڕەوشتانە کامڵ دەکاتو پەنجە دەخاتە سەر جێگەی کەموکورتیەکانیان، ئەوەتا قورئانی پیرۆز لە چەندین ئایەتدا فێری ڕەوشتی جوانمان دەکات، بۆ نموونە کە ئیماندارێك ئەم ئایەتە دەخوێنێتەوە: ﴿والله يُحِبُّ المُحسِنين﴾ هەوڵ دەدات بەرگری لە داماوان بکات و نان و خۆراك بە هەژاران ببەخشێت و بە زانست وزانیاریەکان فریای ئەوکەسانە بکەوێ کە ڕۆحیان تینووە.

ئەو ئیماندارە کە ئەم ئایەتە پیرۆزە ﴿وَلاتَمشي في الأرضِ مَرَحاً، إنَّكَ لَن تَخرِقَ الأرضَ ولَن تَبلُغَ الجِبالَ طولاً﴾ یان ئەم ئایەتە ﴿إنَّ الله

لا يُحِـبُّ المُتَكَبِّـرين﴾ دەخوێنێتـەوە، ئیـدی واز لـە لوتبـەرزی و لـەخۆبایی بـوون و فیزودەمـار دێنێـتو روو لـە تـەوازوعو خـاکێتی دەنێت.

هەر ئیمانداریکیش کە گوێبستی ئایەتی: ﴿إِنَّ الله يُحِبُّ الْمُتَـوَكِّلِين﴾ دەبـێ، ئـیتر دەسـت دەکـات بـە هـەوڵو کۆشـش، هۆکارەکـان بـەکاردەهێنێتو دەسـتبەرداری سـکاڵاو ژان و خەفـەتو پـەژارە دەبێت، بۆ هیچ شتێك ناڵێ پێویستە ئەو کارە بکـەم. بـەڵکو دەڵـێ: ئەگەر خودا ویستی (إن شاء الله) یان دەڵـێ: ( ئەگـەر خێـری تێدایـە خودا بۆمی ئاسان بکـات ). بـەوەش دڵـی لـە نیگـەرانی و دڵـەراوکێ ڕزگار دەبێت و پڕ دەبێت لە ئاسوودەیی و ئارامی و هێمنـی و پشـوو دەدات.

دەتوانین نموونەی تریش بهێنین....

لەلایەکی تریشـەوە دەبیـنین فـەرموودە پیرۆزەکـان کـە باشـترین تەفسـیرو ڕاڤەکـەری قورئـانن– زۆر بـە درێـژی باسـی ئـەم لایەنـە دەکـەن. لـەو فەرموودانـە فـەرموودەی: ﴿إِنَّمـا بُعِثْـتُ لِـأُتَمِّمَ مَكـارِمَ الأخلاقِ﴾ واتـە مـن هـەر بـۆ ئـەوە ڕەوانـە کـراوم تـا ڕەوشـتە بـەرزو جوانەکان تەواو بکەم.

ئاشکرایە هەموو پێغەمبـەرێك نەتەوەکـەی خـۆی فێـری ڕەوشـتی جوان کردووە، هەوڵی داوە لەبـەر ڕۆشـنایی ئـەو ئاکـارو ڕەفتارانـەدا پـەروەردەیان بکـات کـە دەبنـە مایـەی ڕەزامەنـدی خـودا، بـەڵام

پێغەمبەرمان ﷺ نێرراوە تاكو ئەو ڕەوشتانە كامڵ بكات. واتە نێرراوە بۆ ڕوونكردنەوەی باشترین و بەرزترین وانە سەبارەت بە ڕەوشت و ئاكار، ئەو وانەیەی كە بە حەزرەتی ئادەم (علیە السلام) دەستی پێ كردووە، چونكە باشترین و گشتگیرترین پەڕاو بۆ سەر پێغەمبەرمان نێرداوە.

پێویستە زیاتر لەئاست وشەی (تەواو بكەم) دا بوەستین كە لە فەرموودەكەدا هاتووە.. ئاشكرایە ئەگەر شتێ كەموكوڕ بێ تەواو دەكرێت، چونكە ئەگەر شتێك هەر لە ئەسڵدا نەبێ ئەوا تەواوكردن نایگرێتەوە. كەواتە پێشتر ڕەگو بناغەی ڕەوشتە جوانەكان هەبووە، بەڵام بناغەیەكی كەموكوڕو ناكام بووە. بەهۆی كاریگەری ئاینە ئاسمانیەكانەوە لەناو زۆربەی كۆمەڵگەكاندا زۆرێك لە ڕەوشت و ئاكارە بەرزو جوانەكان بڵاو بوونەوەو وای لێ هاتووە كە درۆ شوورەیی بێت، وتی وتیو پروپاگەندە ناپەسەند بێت، زینا قەدەغەبێت، دزی تاوان بێت و بكەرەكانیان سزا بدرێتو تۆڵەی لێ بكرێتەوە. هەموو ئەم بناغە ئاكاریو ڕەوشتیانە لەگەڵ ویستو نیازی خواوەندا دەگوزەرێنو بەشێكن لە ڕەوشتەكانی قورئان. بەڵام بەس نین... جا ئەگەر لەبەر ڕۆشنایی فەرموودەكەی حەزرەتی عائیشەدا (ڕەزای خوای لێ بێ) ئەم فەرموودەیە هەڵسەنگێنین، ئەوا دەگەینە ئەو ئەنجامەی كە هەرچی فەرمان و نەهیەك لە قورئاندا هاتوون پێویستو واجبە هەموویان بە هەند وەربگیرێن. وەك هاندان،

هۆشیارکردنەوەو پەند وەرگرتن... دەبێ ئەوەش باش بزانین کە بە پابەندبوونو شوێنکەوتنی هەموو ئەو فەرمانانە و دوور کەوتنەوە لەو هەموو نەهیانە نەبێ، هەرگیز ڕەوشتی بەرزو جوان بەدەست نایەن.

وەك پێشتر باسمان کرد بە ناو بردنی (مرۆڤی ڕەوشت بەرز) یەکسەر ئەو مرۆڤەمان بەبیردا دێت کە دابو ئاکاری پێکەوەژیانو ڕەچاوکردنی مافی خەڵکی تیادا بەدی دەکەین.

بەبێ هیچ دوودڵیەکیش هەر منداڵێك یان لاوێك بێ فەرمانی دایك و باوکی بکات و ئازاریان بدات یەکسەر سیفەتی (بێ تەربیەت) و (بێ ڕەوشت)ی بەسەردا دەبڕین. بەڵام هەمان بایەخو هەمان هەستیاری بۆ ئەو کەسانە دەرنابڕین کە بێفەرمانی پەروەردگاریان دەکەنو فەرزەکان بەجێ ناهێنن. ئەمەش هەڵسەنگاندنێکی کەموکوڕو ناتەواوە، خۆ ئەگەر حەقیقەتمان بوێت دەبێ ئەم گروپەی دووەمیان لە گروپی یەکەم زیاتر بەدوور بن لە ڕەوشتو پەروەردە. لەئاینی خۆماندا بەچەند پەیڤو وشەیەك وەسفو گوزارش لەو کەسانە کراوە: وەك: فاسق، فاجر، حەرام، کوفر، موشریك...بەگوێرەی پلەی دووربوونی ئەوکەسە لەڕێبازی خواوەند.

با ئەم ئایاتە زۆر بەوردی لێك بدەینەوە: ﴿إن الله لايَغفرُ أنْ يُشرَكَ بهِ ويَغفِرُ ما دونَ ذلكَ لِمَنْ يَشاء﴾ گەورەترین ستەم و تاوانێك کە بەندە دەرهەق بەخوای تەعالا ئەنجامی دەدات ئەوەیە کە شەریکی

بۆ دابنێت. هەر بۆیە زۆر بە ڕەهایی لە لێبوردنی خوایی بێبەش کراوە. واتە ئەگەر تەوبە نەکاتو پەشیمان نەبێتەوە لەو بیروباوەڕە، ئەوا لەسەدا سەد لێی حەرامە بچێتە ناو بەهەشت و شایستەی سزای دۆزەخ دەبێت. ئەگەرچی ئەو کەسە لەگەڵ خەڵکی تردا زۆر بە ئەدەبو ڕەوشت بێت، ئەگەر چی ڕەفتاری لەگەڵیاندا زۆرباش بێت، ئەگەر چی زۆر ڕەچاوی مافی خەڵکی تر بکات، ئەوا هەرگیز ئەو ڕەوشت و ڕۆحەی بەجوان ناژمێررێت، خۆیشی لەلای خودا بەجوان ناژمێررێ، لە بەهەشتیشدا( کە جێگە و ماوای جوانەکانە) هیچ جێگەیەك بۆ ئەو نییە.

بالێرەدا دەستورێکی گرنگی ئیسلام باس بکەین کە دەڵێ: ﴿أحِبُّوا في اللهِ وَأَبْغِضُوا في اللهِ﴾ واتە (لەبەرخوا خۆشەویستی بکەن و لەبەر خودایش تووڕە ببن. ) بەگوێرەی ئەم وانەیەی کە ئەم دەستوورە پێمان دەبەخشێ، ئێمە ئەوانەمان خۆش دەوێت کە خودا خۆشی دەوێن و سیفەتی ڕەوشت جوان و چاكو ڕێكوپێكو جوانیش تەنها بەسەر ئەواندا دەبڕین.

بەلاّم ئەوانەی کە لەخودا یاخی دەبنو لە فەرمانەکانی دەردەچن، ئەوانە بێفەڕترین یان دزێوترین ڕەوشتی خراپیان لێ دەوەشێتەوە، ئێمە هەرگیز ئەوانە بە کەسانی ڕەوشت جوان نازانین و هەرگیز خاوەنی ئاکاری بەرزنین، ئەگەر چی هەندێ سیفەتی باش و ئیجابیان تێدا بێت... بەڵێ، ئێمە مافی ئەو سیفەتە ئیجابیانە

دەدەین و نایفەوتێنین، بەلام وا ئەژماریان ناکەین کە گەیشتبن بەپلەی بەرز و باشی ڕەوشت، هەتاکو نەیەنە ژێر سایەی ئەو ئاکارو ڕەفتارە بەرزو جوانانەی کە پێغەمبەرمان ﷺ نێرراوە بۆ تەواو کردنیان، هەرگیز شایستەی ئەو پلەو پایەیە نابن.

## وەلامی پرسیارێك

خوێنەرێك داوای ڕاو بۆچوونی منی کردبوو سەبارەت بە بابەتی کارکردنی ئافرەت. دەمەوێ بەو خوێنەرە بەڕێزە بڵێم کە لەئیسلامدا هیچ حوکم و بڕیارێك نییە تا ڕێ لە کارکردنی ئافرەت بگرێت. هەروەها لەئیسلامدا پیاویش ناتوانێ‌و بۆی نیە کە بە ئارەزووی خۆی‌و چۆنی بوێت ئاوا کاربکات یان چ کارێك بکات... بەڵێ، لەسەر پیاوە کە کاربکات‌و ڕەنج بدات تاکو خێزان‌و منداڵەکانی بەخێو بکات، بەلام بەو مەرجەی لەناو بازنەی کاسبی حەلاڵدا بمێنێتەوە. خۆ ئەم مەرجە ژنیش دەگرێتەوەو دەبێ ئەویش بە هەمان جۆر ڕەفتار بکات، بۆیە کاتێ داوای ڕاو بۆچوونی من دەکرێ لەبارەی کارکردنی ئافرەتەوە، پێویستە بەڕوونی‌و دوورو درێژی باسی شوناسی ئەو کارە بکرێت، هەروەها تا چەندە ئەو ئافرەتە لەو کارەیدا خۆی بەگوناح و خراپەوە ناگلێنێ و چەند لەحەرامەوە دوورە، تەنها ئەو کات وەلامی ئەو پرسیارە هەر بەخودی پرسیارەکەوە دەردەکەوێت.

وێــڕای ئەمــەش حەقیقــەت ئەوەیــە کــە: گــرنگترین فــەرمان‌و گەورەترین ئــەرکی ژن وا لــەناو ماڵەکەیــداو لەگــەڵ خێزانەکەیدایــە. بەرزترین ئامانجیش ئەوەیە کە منداڵەکانی پــەروەردە بکــات. واتــە منداڵــەکانی بــەو جــۆرە پــەروەردەو گــۆش بکــات کــە پەیوەســت و هۆگری ئاینەکەیان و پەروەردگاریان بن، هــەروەها ببنــە هاوڵاتیــەکی چاک‌و ئەندامێکی بەکەڵك و سوودبەخشی کۆمەڵگە. هــەروەها ئــەرکی سەرشانیەتی کە مێژووی نەتەوەکەیان فێربکــات تــاکو لــە داهــاتوودا بتوانن دۆستان و دوژمنانی خۆیان لێك جیابکەنەوە.

واجــب نیــە لەســەر ژن کــە فێــری زانســتی کیمیــا ببێــت، بــەڵام واجبیەتی کە بگاتە ئاستی پێگەیشــتن و توانــای ئــەوەی کــە بتــوانێ توێژینــەوەو لێکدانــەوەی فیکــرو هــزر بکــات‌و لــەم بــوارەدا بگاتــە ڕادەیەك کە بتوانێ ڕاستیە بــەرزەکان پێشکەشــی منداڵــەکانی بکــات وەك چۆن ڤیتامینەکانیان پێشکەش دەکات.

هەروەها واجبــی ژن نیــە کەببێتــە پســپۆڕی زانســتی جیۆلــۆجی‌و چینەکانی زەوی، بەڵام پێویستە لەسەری کە زانست‌و شــارەزاییەکی تەواوی بەناخی ڕۆح‌و هەست‌و سۆزی منداڵــەکانی هــەبێت و بەباشــی شارەزایان ببێت.

دەتوانین چەندین نموونەی تریش تۆماربکەین.

با خوێنەری ئازیزم ڕێم پێ بدات دەســتەواژەی پرســیارەکەی لــە: (ئایا ئەرکی سەرشانی ژنە کە کار بکات؟ ) بگۆڕم بۆ دەســتەواژەی:

ئایا ئەرکی سەرشانی ژنە کە خوێندەوارو ڕۆشنبیرو شارەزا بێت؟ بۆ ئەوەی بڵێم:

پێویستە ژن فێر ببێت، پێویستە ڕۆشنبیر بێت، پێم وایە ئەمە ئەرکی سەرشانیی خۆیەتیو نابێ چاوپۆشی لێ بکات، بەڵام لەو مەیدانەدا کە سوودی لێ وەردەگرێ و پێویستی پێیەتی، بە تایبەت لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیدا. هەروەها پێویستە لەسەر ژن (ئەگەر زۆر زۆر پێویست نەبوو) لەدەرەوەی ماڵی خۆی دا کارنەکات. ئەگەر ناچاری کارکردن بوو دەبێ هەوڵ بدات هەلومەرجی ژیانی خۆی و کارەکەی بەجۆرێك ڕێك بخات کە زۆر لە منداڵەکانی دانەبڕێت.

لەوانەیە کەسانێك دەرکەون کە لەم بارەیەوە پشتگیریم بکەن یان دژم بوەستن. ئەوەش لەکەشو هەوای ئازادی بیرو بۆچووندا شتێکی ئاساییو سروشتیە. بەڵام بە تەواوی دژی ئەو کەسەم کە بیەوێ وامان تێ بگەیەنێت کارکردنی ژن لەدەرەوەی ماڵەکەی خۆیدا بەخەڵاتو بەراتو دیاریو چاکەیەك دەژمێررێ لەگەڵ ئەو ژنە، وەك بڵێی بەوە چاکەیەکی لەگەڵدا بکەین. ئەوە لە باشترین هەلومەرجدا بەساویلکەییەکی قبوڵ نەکراو دەژمێررێ. بەڵام دەبێ دان بەوەشدا بنێین کە بەهۆی باری ئابووریەوەو پاشان بەهۆی زیادبوونی هەڵەخەرجیو زیادەمەسرەفو خۆش گوزەرانی ژینی ئێستامانەوە، با ئەوەش بوەستێ کە ئێستا ئافرەت کەمتر پشت بەپیاو دەبەستێ و متمانەی پێ دەکات. ئەم هۆکارەی دوایی پشکێکی گەورەی لەم

